## ناسنامەی کتێب

نوێژە سوننەتەکان
بابەت: ئایینی
ئامادەکردن: یاسین مەلا عبداللە چۆمبارۆکی
چاپ: چاپی دووەم ۲۰۱۰
تیراژ: ۵۰۰۰
چاپ و دابەشکردن : کۆمەڵگای فەرهەنگی ئەحمەدیٚ خانی
سۆران : بەرامبەر یاریگا ـ ۰۷۵۰ ۷۵۵ ۸۰ ۹۰

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (۷۸٦) ی ساڵی(۲۰۱۰)ی پێدراوە

## پێشەکی چاپی دووەم

الحمد لله رب العالمين قيوم السموات والأرضين مدبر الخلائق أجمعين ، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، الملك الحق المبين ، وأشهد أن محمدًا عبده ورسوله ، الصادق الأمين ، صلى الله عليه وسلم وعلى آله وصحبه أجمعين .

کە ئەم نامیلکەمان بۆ جاری یەکەم چاپ کردو کەوتە بازار، سوپاس بۆ خوا بەماوەیەکی کەم لەبازاردا تەواو بوو ،بۆیە بە پێویستمان زانی دەست بە چاپی دووەم بکەین و وێرای پێداچونەوەو زیادکردنی هەندێ بابەتی تر.

ئه‌مـــه‌و گــه‌وره‌یی وبــالآ ده‌ســـتی هــه‌ر شــایه‌نی خوایه‌.

یاسین ملا عبدالله چۆمبارۆكی
پێش نوێژوو وتـار خوێنی مزگه‌وتی
(سعید حاجی صـالح خۆشناو)
سۆران ـ گه‌ره‌كی نه‌ورۆز
چوارشه‌ممه - ٢٠١٠/٨/٨
chombarok_2006@yahoo.com

## نوێژی سوننەت

سـوننەت لەزمانەوانیـدا: زیادەیـە و لـە شەرعیشدا جگە لە فەرزەکان، چونکە زیادەیەکە دەیکەی.

وە هـەروەها پێـی دەڵـێن: نـەفل، مەنـدوب، موستەحەب.

قازی[1] و هەندێ لە زانایان دەڵێن:

سوننەتەکان دەبنە سێ بەش:

١-تەتەوع واتا ئەوەی هیچ شتێکی بە تایبەت دەربارەی نەهاتووە.

٢-سوننەت: ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

---

[1] کوڕی عصرون (باوکی سەعید شرف الدین) ناوی: عبدالله کوڕی محمد کوڕی المطهر بوو. قازی قازییان بوو لە سەردەمی خۆی لە ساڵی ٤٩٣ لە دایك بووە، قوتابی ابن العساکر بووە.

بەردەوام ئەنجامی داوە.

٣-موستەحەب: هەندێ جار پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەنجامی داوە[1].

## ئاگاداربە....

لە دوای ئیسلام بوون نوێژکردن لە گشت خواپەرستییەکانی بەلاشە دەکرێن گەورەترە، کەوا بوو: نوێژی واجب لە گشت واجبەکان گەورەترە و، نوێژی سوننەتیش لە گشت سوننەتێك گەورەترە.

بەڵام قورئان لەبەرکردن و خەریك بوون بە زانستی ئایینی خێری زۆرترە لە نوێژی سوننەت، چونکە ئەو دووانە (فرض الكفاية)نە.

---

[1] مغني المحتاج، شمس الدين محمد بن محمد الخطيب الشربيني-ج١، ص٤١٢، باب في صلاة النفل.

هەروەها خێری واجب حەفتا پلە گەورەترە لە خێری سوننەت.

کەواتە پێویستە مرۆڤی موسڵمان (لەدوای بەجێهێنانی واجب) زۆر سوننەت بکا و بەردەوام بێ لەسەریان، بۆ ئەوەی ببێتە دۆستی راستەقینەی خوای گەورە، هەروەك خوای گەورە لە حەدیسێکی قودسیدا دەفەرمووێ: (مَنْ عادى لي ولياً فَقَدْ آذنتهُ بالحَربْ، ومَا تقرب إليَّ عبَدي بشيءٍ أحَبَّ إليَّ ممّا افترضتهُ عليه، ولاَيَزالُ عبدي يتقَرَبُ إليَّ بالنوافِل حتى أحِبَهُ....)[1].

واتا: (هەرکەسێك دژایەتی دۆستێکی من بکا، ئەوە بە ڕاستی ئاگادارم کردەوە: جەنگی لەگەڵ دەکەم، هیچ شتێك لەلای من لە بەجێهێانی واجب

[1] صحيح –رواه البخارى (٦٥٠٢).

خۆشەویستر نییە، كە بەندە بیەوێ خۆی پێی لەمن نزیك بكاتەوە، بەندەی من بەردەوام بە سوننەت كردن خۆی لە من نزیك دەكاتەوە تا خۆشم دەوێ...).

## گرنگی نوێژی سوننەت

۱-نوێژ باشترین كردەوەیە:

هەروەكو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: (إستَقيموا ولَنْ تُحصوا، واعلموا ان خيْرَ أعمالكم الصَلاة)[1].

واتا: (بەردەوام بن و راگیر بن لەسەر واجب و سوننەتەكان بەبێ زیادەڕەوی، چونكە ئێوە ناتوانن بگەنە كۆتایی ئەو كارانە و، بشزانن چاكترین كردەوەتان نوێژە).

(1) أخرجه إبن ماجه (٢٧٧) وغيره وله أسانيد يصح بمجموعها.

## ٢-سـوننەتی زۆر ،بـاوەڕدار بەرزدەکاتـەوە لـە بەهەشت:

هـەروەکو ڕەبیعـەی کوڕی مـالیکی ئەسلەمی دەڵـێ: لەگـەڵ پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) دەمامـەوە و جارێـك ئـاوی دەسـتنوێژم بـۆ بـرد و ئـەویش فـەرمووی: داوا بکـە، منـیش وتم: داوام ئەوەیـە لەگەڵ تۆ بم لە بەهەشت!

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: جگە لەمە؟

دەڵێ وتم: داواکاریم هەر ئەوەیە.

دەڵێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: **(فأعنيّ على نَفْسك بكَثْرة السُّجود)**[1].

---

(1) أخرجه مسلم (٤٨٩)، صحيح مسلم بشرح الإمام النووي، رقمه وخرّج أحاديثه: محمد فؤاد عبدالباقي، حققه: الشيخ عرفان حسونه، الجزء الثالث، الطبعة الأولى، ١٤٢٠هـ - ٢٠٠٠م، دار أحياء التراث العربي للطباعة والنشر والتوزيع.

واتا: (یارمەتیم بدە بە ئەنجامدانی سوژدەی زۆر).

وە هەروەها جارێك سەوبان (رضي الله عنه) لە پێغەمبەری پرسی کردویەکم فێر بکە بەهۆیەوە بچمە بەهەشت، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (عَلَيْكَ بكثْرة السُجوُد فإنكَ لا تَسْجُد لله سَجدةَ إلا رفَعَك الله بها درجة وحطَ عَنْكَ بها خَطيئةَ)[1].

واتا: (زۆر سوجدە ببە (زۆر نوێژ بکە) چونکە هەر سوژدەیەك بۆ خوا ئەنجام بدەی، ئەوە خوای گەورە پلەیەکت بەرز دەکاتەوە و گوناهێکت لەسەر لادەبات).

---

(1) أخرجه مسلم (٤٨٨) صحيح مسلم بشرح الإمام النووي (٢٩٨/٣)

-نوێژی سوننەت کەم و کوڕی نوێژی واجب پڕ دەکاتەوە : چونکە لە ڕۆژی دوایی، یەکەم شت کە بەهۆیەوە لێپێچینەوە لەگەڵ بەندە دەکرێ: نوێژە.

## نوێژی سوننەت دوو بەشە (١)

---

(1) هەروەکو لە (مغنی المحتاج) هاتووە، کە بەشێکییان بە کۆمەڵ بکرێن چاکتر و ئەویتریان بەبێ جەماعەت.
وە هەندێ لە زانایان دەڵێن: نوێژی سوننەت دوو بەشە:
أ-ئەوانەی رەهان، هیچ کاتێکی دیاریکراویـان نییـە و بـێ هـۆش ئەنجام دەدرێن و ژمارەی رەکعەتیان دیار نییە.
ب-سوننەتی موقەیەد: کە ئەویش دەبێتە دوو بەش:
١-سوننەتی دامەزراو (الرواتب).
٢-سوننەتی نادامەزراو (غیر الرواتب).
هەروەکو لە صحیح فقه السنه هاتووە (١/٣٦٩).
* ئیمـامی غـەزالی (رحمه الله) لـە إحیـاء علـوم الـدین ( ١/١٧٣) سوننەت دەکاتە چوار بەش:



١- ئەوانەی رۆژانە دووبارە دەبنەوە.

یەکەم ـ ئەو سوننەتانەی (سوننەت نییە) بە جەماعەت بکرێن.
دووەم ـ ئەو سوننەتانەی(سوننەتە) بە جەماعەت بکرێن.

## یەکەم: ئەو سوننەتانەی ( سوننەت نییە ) بەجەماعەت بکرێن:

ئەویش دەبێتە دوو بەش:

١-ئەو سوننەتانەی تایبەتن بە نوێژە فەرزەکان.

---

٢- ئەوانەی هەفتانە دووبارە دەبنەوە.
٣- ئەوانەی ساڵانە دووبارە دەبنەوە.
٤- ئەو سوننەتانەی کاتێکی دیاریکراوییان دیار نییە، بەڵکو تایبەتن بە هۆکار، وەکو سوننەتی (تحیە المسجد) تا ئەچیە ناو مزگەوت ئەنجام نادرێت...هتد.

## ٢–ئـەو سـوننەتانەی پەیوەنـدییان بـە نوێـژە فەرزەكان نییە.

١– ئەو سوننەتانەی تایبەتن بە نوێژە فـەرزەكان ئەویش دوو بەشە:

أــ ئەوانــەی (ســنة المؤكــده)ن زۆر خێــرن و پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام بووە لەسەریان.

ب ـ ئەوانەی (مؤكد) نین.

### أ ـ ئەوانەی (سنة المؤكدة)ن:

١–دوو ركعەت پێش نوێژی بەیانی هەروەكو خاتوو عائیشە (ر.خ) دەڵێت: (أن النبي (ﷺ) لمْ يَكنْ على شيء من النوافل، أشدَّ معاهدةً منهُ على ركْعَتَيْن قبلَ الصُبْحِ)[1].

---

[1] رواه مسلم (٧٢٤)

واتا: (پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەندەی بەردەوام بوو لەسەر دوو رکعەت سوننەتی پێش نوێژی بەیانی، ئەوەندە لەسەر سوننەتەکانی تر بەردەوام نەبوو).

دوو رکعەتەکە بە نیەتی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی، یان سبەینێ، جا لە دوای فاتیحە: لە رکعەتی یەکەمدا﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ و، لە رکعەتی دووەم ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ بخوێنە.

وە هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی گەورەیی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی فەرموویەتی:(ركعتا الفَجْر خيْرٌ منَ الدنيا ومَا فيها)[1].

واتا: (دوو رکعەتی بەیانی باشتر و چاکترن لە

---

[1] رواەمسلم (٧٢٥).

دونیا و ئه‌وه‌ی له‌ ناویه‌تی).

٢–دوو ركعه‌ت پێش نوێژی نیوه‌ڕۆ.

٣–دوو ركعه‌ت دوای نوێژی نیوه‌ڕۆ.

٤–دوو ركعه‌ت دوای نوێژی مه‌غریب، ئه‌گه‌ر بكرێت له‌ماڵه‌وه‌ بكرێت، هه‌روه‌كو ئیبن عومه‌ر (رضي الله عنه) ده‌ڵێت: **(كانَ النَّبي (صلى الله عليه وسلم) لايُصلى الركعتين بعد المَغرِب، والركعَتَيْن بَعدَ الجُمعةَ إلا في بَيْتِه)**[1].

واتا: (پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) دوو ركعه‌تی سوننه‌تی دوای مه‌غریب و دوای هه‌ینی له‌ ماڵ نه‌بێ نه‌ئه‌كرد).

٤–دوو ركعه‌ت دوای نوێژی عیشا

به‌ڵگه‌ی ئه‌م سوننه‌تانه‌ی باسم كردن، ئه‌و

---

[1] أخرجه الترمذي (٤٣٢) والطحاوي (٣٣٦/١).

فه‌رمووده‌یـه كـه ئیمـامی بوخـاری و موسـلیم باسیان كردووه له ئیبن عومه‌ر (رضي الله عنه) كـه ده‌ڵـێ: **(حفظتُ منْ النبي (صلى الله عليه وسلم) عَشْرَ ركعـاتٍ: ركعتَـيْن قبل الظُهرْ، وَركعَتين بعْدَها، وَركعَتين بَعدَ المَغرب في بَيْته، وَركعَتين بَعْدَ العَشاء في بَيْتِه، وَركعَتَـيْن قَبْلَ صَلاة الصُبْح.......)**[1].

واتا: (ده ركعه‌ت سوننه‌تم له پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) وه‌ بیردێ به‌رده‌وام ده‌یكردن: دوو له پێش نوێژی نیوه‌ڕۆ، دوو لـه دوای نێـوه‌ڕۆ، دوو لـه دوای مه‌غریب له ماڵه‌وه ده‌یكردن و دوو لـه دوای عیشا و دوو له پێش نوێژی سبه‌ینێ....).

---

[1] رواه مسلم (٧٢٩)، الفقه المنهجي على مذهب الإمام الشافعي، الدكتور مصطفى الخن، الدكتور مصطفي البغـا علـي الـشربجي (٢١٣/١) دار إحسان للنشر والتوزيع -طهران، إيران ١٤٢١هـ -٢٠٠١م.

## ب ـ ئەو سوننەتانەی (مؤکد) نین:

١-دوو رکعەتی تر پێش نوێژی نیوەڕۆ (واتا نیوەڕۆ بە دوو رکعەتی تر کە باسمان کرد دەبێتە چوار رکعەت.. دوو رکعەت، دوو رکعەت پێکەوە دەکرێن).

هەروەکو خاتوو عائیشە (ر)دەڵێت: **(ان النبي (ﷺ) كان لا يَدَعُ أربعاً قَبْلَ الظُهر...)**[١].

(پێغەمبەر (ﷺ) وازی لە چوار رکعەت پێش نوێژی نیوەڕۆ نەدەهێنا).

وە هەروەها کە پرسیاری سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە خاتوو عائیشە کرا وتی: **(كان يُصلي في بيتي قَبْلَ الظُهر أربعاً، ثُمَّ يُخرج فيُصلي بالنَّاس....)**[٢].

---

[1] رواه البخاري (١١٢٧).

[2] رواه مسلم (٧٣٠).

واتـا: (لـە مـاڵی مـن چـوار ڕکعـەتی سـوننەتی دەکرد پێش نوێژی نیوەڕۆ، ئەوجا دەچووە دەر و پێش نوێژی بۆ خەڵك دەکرد.

٢–دوو ڕکعەتی تر دوای نوێژی نیوەڕۆ:

هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفـەرمووێت: **(مَنْ صَلّى أربَع ركعاتٍ قَبْلَ الظُهر، وأربعاً بَعْدَها، حَّرمَهُ الله على النّار)**[1].

واتا (هەر کەسـێ پـێش نیـوەڕۆ چـوار ڕکعـات بکات و دوای نیوەڕۆش چوار ڕکعات سوننەت بکات، خوای گەورە قەدەغەی دەکـات لـە ئـاگری دۆزەخ).

[1] رواه الخمسة وصححه الترمذي (٤٢٧، ٤٢٨) عن أمّ حبيبة (ر).

وە هـەروەها لـە دوای نوێـژی جومعـەدا چـوار رکعەت سونەتن:

بـە نیـەتی سـوننەتی دوای جومعـە، پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرمووێ (إذا صـلّى أحَـدُكَمْ الجمعـة فليُصَلِ بَعْدَها أربَعاً)[1].

واتـە (هـەر کاتێـك یـەکێکتان نوێـژی جومعـەی کرد با چوار رەکعەت نوێژی سوننەتیش لە دوای بکا).

وەهەروەها لە پێش نوێـژی جومعـەش بـە هـەمان شێوە.

٣-چوار رکعەت پێش نوێژی عەسر:

هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (رَحِم اللهُ أمرءاً صلّى قَبْلَ العصر أربعاً)[2].

---

(1) رواه مسلم (٨٨١) عن أبي هريرة.

(2) رواه الترمذي (٤٣٠) و أبو داود (١٢٧١) وقد صححه الألباني.

واتا: (خوا رەحم بەو کەسە بکا: کە لە پێش نوێژی عەسردا چوار رکعەت سوننەت دەکا).

٤-دوو رکعەتی سووك پێش نوێژی مەغریب:

هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (صَلوا قبْلَ المَغرِب، صَلوا قبْلَ المَغرِب، ثُمَ قالَ في الثالثة، لمنْ يَشاء)[1].

واتا: (پێش مەغریب نوێژ بکەن (سوننەت)، پێش مەغریب نوێژ بکەن، پاشان لەجاری سێیەم وتی: ئەوەی دەیەوێت.

وە هەروەها ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەڵێت: لە مەدینە بووین : (فإذا أذَنَ المُؤذنُ لصَلاة المَغْرِب إبتَدَروا السَّواريَ، فيَركَعونَ ركعَتَيْن ركعَتَيْن، حتى إنَّ الرَجُلَ الغَريبَ ليدخُلُ المَسجدَ

---

[1] أخرجه البخاري (١١٢٩) عن عبدالله بن مغفل المزني.

**فَيَحْسَبَ أنَ الصلاةَ قَدْ صُلِّيتْ من كثرةِ من يُصَلِّيها)**[1].

(لــە مەدینــە، کــە بــانگی مــەغریب دەدرا، خەڵکەکە روویان لە دینگەکانی مزگەوت دەکرد و دوو رکعـــەت دوو رکعـــەت ســـوننەتی پـــێش مەغریبیان دەکرد، هەتا ئەگەر کەسێکی بیانی هاتبایە ناو مزگەوت، وایدەزانی خەڵکەکە نوێژی مەغریبیان کردووە).

٥-دوو رکعەتی سووك پێش نوێژی عیشا:

هەورەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(بين كُلّ أذانينْ صلاةٌ ثم قال في الثالثة (لِمَنْ شاء)**[2].

(لە نێوان گشت بانگ و ئیقامەتێکدا نوێژێکی سوننەت هەیە).

---

(1) أخرجه مسلم (٨٣٧).

(2) أخرجه مسلم(٨٣٨) عَن عبدالله بن مغفل المزيني.

**ئەمەی خوارەوەش خشتەی نوێژ و سوننەتەکانی پێش و دوای نوێژن:**

| نوێژ | ژمارەی ڕەکعەتەکانی واجب | سوننەتی موئەکەدە | | سوننەتی نا موئەکەدە | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | پێش نوێژ | دوای نوێژ | پێش نوێژ | دوای نوێژ |
| بەیانی | ٢ | ٢ | — | — | — |
| نیوەڕۆ | ٤ | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ |
| عەسر | ٤ | — | — | ٤ | — |
| مەغریب | ٣ | — | ٢ | ٢ | — |
| عیشا | ٤ | — | ٢ | ٢ | — |

٢ ـ ئەو سوننەتانەی پەیوەندییان بە نوێژە فەڕزەکان نیە:

ئەویش دەبێتە دوو بەش:

أ- ئەو سوننەتانەی کاتی دیاریکراویان هەیە.

ب ـ ئەو سوننەتانەی کاتی دیاریکراویان نییە.

## أ ـ ئەو سوننەتانەی کاتی دیاریکراوییان هەیە

### شەو نوێژ

هەر نوێژێکی سوننەت بە شەو بکرێ پێی دەگوترێ (صلاة اللیْل-شەو نویژ) بەلام (تهجد) بەو نوێژکردنە دەگوترێ کە بە شەو لە دوای خەوتن و لە دوای کردنی نوێژی عیشا دا بکرێ.

کەواتە: گشت (تهجد)ێك شەونوێژیشی پێ دەگوترێ،بەلام گشت شەونوێژێك (تهجد)ی پێ ناگوترێ.

شەو نوێژ پاداشتێکی گەورەی هەیە، هەر بۆیە خوای گەورە فەرمان بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکات، کە شەونوێژ بکات بۆ ئەوەی بگاتە پلەی

بەرز و (مقام المحمود) ﴿وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَكَ عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا﴾[1].

(لە بەشێکی شەوگاردا خۆت ماندوو بکە بە دەورکردنەوەی قورئانەوە لە شەونوێژدا کە زیادە ئەرکێکە لە سەرتۆ، بۆ ئەوەی پەروەردگارت بتخاتە شوێن و جێگەی بەرێزەوە کە تیایدا سوپاسکراو بیت).

وە هەروەها لە دەیان شوێن خوای گەورە باسی گەورەیی و پاداشتی شەونوێژ دەکات[2].

وە هەروەها لە پێغەمبەریان پرسی : لە دوای نوێژی واجب، کامە نوێژ لە هەموویان خێرترە،

---

(1) سورە الإسراو ٧٩

(2) سورەتەکانی (آل عمران: ١١٣، الفرقان: ٦٣-٦٤، المزمل: ١-٤، الإنسان: ٢٥-٢٦، الزمر: ٩، الذاريات: ١٥-١٨، السجدة: ١٥-١٧)

ئــــەویش فــــەرمووی: **(الــــصلاةُ في جَــوْفِ الليلْ....)**[1].

(نوێژکردن لە قوڵایی شەودا...).

بۆ لە قوڵایی شەودا نوێژکردن و یادی خوا خێری زۆرە؟!

چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: **(يَنزلُ ربُّنا تَبارَكَ وتعالى كُلَّ ليلةٍ إلى السماء الدنيا، حينَ يَبْقى ثُلُثُ اللّيلِ الآخرِ فيقول: مَنْ يَدعُوني فأسْتَجيْبَ لَهُ، وَمَنْ يسألني فأُعطيه، وَمَنْ يستَغفِرني فأغفر لَهُ)**[2].

(قودرەتی خوا هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا لەوکاتەی سێیەکی شەو ماوە و

---

[1] رواه مسلم (١١٦٣) عن أبي هريرة.

[2] رواه مسلم (٧٥٨) عن أبي هريرة.

دەڵێ: کێ بانگم دەکات بۆ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە؟ کێ داوام لێ دەکات بۆ ئەوەی بیدەمێ؟ کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات بۆ ئەوەی لێی خۆش بم).

کەوابوو: ئەو هەڵە لە دەست خۆت مەدە، بە شەو لەخەو هەڵسە و شەونوێژ بکە، هەرچەند تەنها دوو رەکعەتیش بێ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (عَلَيْكُمْ بِقيامِ اللّيلِ فانّهُ دأْبُ الصالحين قَبْلَكمُ، وهوَ قربةٌ إلى ربِّكم، ومَكْفَرةٌ للسيئات ومَنْهَاةٌ عَنْ الإثمِ ومَطْرَدَةٌ للداء عن الجَسَد)[1].

شەو نوێژ بکەن، چونکە شەونوێژ پیشەی پیاوچاکانی پێش ئێوەیە و لەخوای خۆتان نزیك

(1) رواه أحمد وغيره.

دەكاتەوە و تاوانەكانتان دادەپۆشێ و گوناهتـان لێ قەدەغە دەكا و دەرد لەلاشەتان دەردەكا.

## كاتی شەونوێژ

دروسـتە لـە سـەرەتای شـەو و ناوەنـدی و كۆتاییەكەی، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) لە هەرسێ كاتەكـەی ئـەنجام داوە، بـەڵام ناوەنـدی شـەو (ئەگەر شەوەكە بكرێتە سێ بەش) خێری گـەورە ترە لە سەرەتا و ئـاخیری شـەو، پاشـان ئـاخیری شـەویش خێـری گـەورەترە لـە نیـوەی یەكـەمی شەوێ (ئەگەر شەوەكە بكاتە دوو بەش)[1].

سوننەتی شەو یاخو رۆژ دوو رەكعەتە و سەلام دەدرێتـەوە هـەروەكو پێغەمبـەر (ﷺ)

---

[1] مغني المحتاج (١/٤٢٦).

دەفەرمووێ **(صلاة الليل والنَهار مَثنى مثنـى)**[1].

واتا(**سوننەتەکانی شەو و ڕۆژ دوو دووە**).

کـەوابوو هەرکەسـە و توانـای خـۆی، ئەگـەر توانـای هـەبێ ناوەنـدی شـەو هەڵسە و شـەونوێژ بکە کە لـە هـەموو کاتـەکانی تـر خێـری زیـاترەن ئەگەر نەتوانی پێش نوێژی بەیانی شەونوێژ بکـە، ئەگەر نەتوانی لەکاتی نووستن یاخود هەر لەدوای نوێژی عیشا ئەنجامیان بدە.



---

(1) رواه أبو داود بإسناد صحيح.

## ژمارەی رەكعەتەكانی شەونوێژ

ژمـارەی رەكعەتـەكان دیـاری نـەكراوە، بـەڵام سوننەتە بـە دوو رەكعـەتی سـووك دەسـت پـێ بكەیت، هەروەكو پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرمووێ (إذا قامَ أحدُكمْ من اللّيل فليفتَحْ صلاتَهُ بِـركْعَتَيْن خَفيفَتَيْن)[1].

هەر كاتێك یەكێكتان بە شەو هەڵسا بۆ (تهجد) كـردن، بـا لـە پێـشدا بـە دوو رەكعـەتی سـوك دەست بە نوێژ بكا.

ئەوجا دەست بكات بە نوێـژكردنی دوو رەكعـەتی تا توانای هەیە و هەر كاتێك ویـستی بخـەوێ یـان ترسی بانگی بەیانی هەبوو ئەوە وتر بكات.

هەروەكو پێغەمبەر (ﷺ) لە وەڵامی پیاوێك

(1) رواه مسلم (٧٦٨) (٤/ ٨٧) عن أبي هريرة.

كه پرسی شه‌ونوێژ چۆنه؟
فه‌رمووی (مَثْنى مَثْنى، فإذا خِفْتَ الصُبْحَ فأوتِرْ بواحدَةٍ)[1].
(دوو دوو، ئه‌گه‌ر ترسی به‌یانیت په‌یدا بوو كۆتایی پێ بێنه به یه‌ك ره‌كعه‌تی وتر).
وه فه‌رموودەمان هه‌یه كه پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) حه‌وت ره‌كعه‌تی كردووه و نۆ ره‌كعه‌تی كردووه و یازده ره‌كعه‌تی كردووه، كه ئه‌مه‌ش قسه‌ی خاتوو عائیشه‌یه (ره‌زای خوای لێبێت).
وه هه‌روه‌ها سیازده ره‌كعه‌تیشی كردووه.

## هه‌ندێ له ئادابه‌كانی شه‌ونوێژ

١-ئاماده‌كاری بكات بۆ شه‌ونوێژ به:
أ-نوستنی كاتی (قیلوله) پێش نیوه‌ڕۆ.

---

[1] رواه مسلم (٧٤٩) (٤/ ٦٧) عن أبي عمر.

ب-هەوڵ بدە شەو زوو بخەوی.

٢-لە کاتی نووستن نیەتی هەبێ کە شەو هەڵدەستێتەوە و مەبەستی هەستانەوە بێت.

٣-بەدەستنوێژ بنووێت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) وای کردووە.

٤-لەسەر تەنیشتی راستی بخەوێت.

٥-لەکاتی نووستن یادی خوا بکات و ئەورادی شەو بخوێنێ پێغەمبەر (ﷺ) کە دەهاتە ناو جێگا سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾. ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ دەخوێند و فووی لە دەستەکانی دەکرد و بە لاشەی خۆی دادەهێنا.

٦-کە لە خەو هەڵسا یادی خوا بکات و یەکسەر دەستنوێژ هەڵگرێت.

٧- سیواك بەکاربهێنێت.

٨-شەونوێژەکە بە دوو ڕەکعەتی سوک دەست پـی بکـات و پاشـان هـەوڵ بـدات قورئـان زۆر بخوێنێت لەناو نوێژەکان.

٩-هـەر کاتێك توانـات نـەما، مانـدوو بوویـت، دەتوانی کەمێ بخـەوی، پاشـان دووبـارە دەست پێ بکەیتەوە.

١٠-زۆر دوعـا بکـە بـە تایبـەت لـە وەخـتی سـەحەر، چـونکە پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرمووێ (إنَّ في اللَّيل لساعةً، لا يُوافقُها رجلٌ مسلمٌ يسألُ الله خيراً منْ أمْرِ الدُّنيا والآخرةَ، إلا أعطاهُ إياهُ، وذلكَ كلَّ ليلةٍ)[1].

(لـە شـەو کاتـژمێرێك هەیـە هـەر کەسـێکی موسڵمان بیگاتێ و داوای خێری و دونیا یا

[1] رواه مسلم (٧٥٧) عن جابر.

قیامەت بکات، ئەوە خوا دەیداتێ، ئەمەش لە هەموو شەوێکە.

١١-وا باشە پیاو بانگی خێزانەکەشی بکات، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) داوای رەحمەتی کردووە بۆ ئەو پیاوەی شەونوێژ دەکات و و بانگی خێزانەکەشی دەکات، یاخود ئەو ئافرەتەی شەونوێژ دەکات و بانگی مێردەکەی دەکات و ئەگەر بە ئاگاش نەهات هەندێ ئاوی دەپرژێنێتە دەم و چاوی بۆ ئەوەی بە ئاگا بێت!

١٢-وە ناپەسەندە واز لە (تهجد)ێك بێنی کە کردوتە پیشەی خۆت.

مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس دەفەرمووێت[1]:.

---

[1] خوای گەورە غەریقی رەحمەتی بکات و بە بەهەشتی پان و بەرینی شاد بکات.

لای كـەمی ئـەم نوێـژە (مەبەسـتی شـەونوێژە) دوو ركاتـە و لای ژووررووی ئەندازەیـەكی دیـاریی نییە، بەڵام كەڕاهەتی هەیە (قیام)ی هەموو شەو و بەتایبەتی شەوی جومعە، هـەروەكو كەڕاهـەتی هەیە تەركی (تهجد) بۆ كەسێك كە عادەتی پێـوە گرتبێ.

سوننەتە بۆ ئەو كەسەی شـەونوێژ ئـەكات، بـە رۆژا چێشتە خـەو بكـا و لـە ئـەوەڵی شەویشەوە ماوەیــەك بنــوێ تــا بتوانــێ بــە ئیــسراحەت هەڵبستێتەوە و نوێژەكەی بكا.

ئەگەر كەسێك رێبوار بوو و نەیئەتوانی شەو هەڵسێتەوە بۆ نوێـژی تەهجد، ئـەتوانێ پـاش نوێژی عیشا و (راتبە) و وەتر دوو ركـاتی تـر بكـا لە جیاتی شەونوێژ.

سوننەتە كەبە شەو خەبەری بووە و دەست

بە رووبا بێنێ و رووبکاتە ئاسمان و ئایەتی: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ﴾. بخوێنێ، شەو نوێژەکەی بە دوو رکات نوێژ دەست پێ بکا و دوعا و ئیستیغفار بکا و لە خوا بپارێتەوە[1].

## چۆنیەتی ئەنجامدانی شەونوێژ

کە دەست نوێژت هەڵگرت و هاتیە سەر بەرماڵ و رووت لە قیبلە کرد، دەستەکانت بەرز کەوە و بڵێ (نَوَيْتُ أُصلي رکعَتَيْن صلاة التَهجد (قيام اللّيل) لله تعالى، ألله أكبر)[2].

---

(1) شەریعەتی ئیسلام بە پێی پەیرەوی ئیمامی شافیعی –دانراوی مەلا عەبدولکەریمی مدرس، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژهەڵات، ٢٠٠٩، هەولێر.

(2) زۆر جۆرە نیەت هەیە و ئیختیلافیش لەسەر هەندێ وشە هەیە.

**(نیەتم وایە دوو رەکعەت نوێژی تهجد(شەو نوێژ) دەکەم، بۆ خوای گەورە ، ألله أكبر).**

پاشان دەستی راستە لەسەر دەستی چەپەت دادەنێی و دەست بکە بە خوێندنی دوعای **(وَجَهْتُ وَجْهي للذي فطرَ السموات والأرض حَنيفاً وَما أنا مِن المشركين، انَّ صلاتي و نَسُكي ومحيايَ ومَماتي لله ربِّ العالمينْ، لا شَريكَ لَهُ وبِذلك أُمرتُ وأنا من المسلمين)**[1].

ئەوجا بڵێ **(أعوذُ بالله منَ الشَيْطان الرَجيم)** و دەست بکە بە خوێندنی سورەتی **(الفاتحة)** و دوای فاتیحە سورەتێك بخوێنە و برۆ رکوع و هەستەوە و پاشان برۆ سوجدە و سێ جار بڵێ **(سبحان ربي الاعلى وبحمده)** و دابنیشەو دووبارە

---

[1] رواەمسلم (٧٧١)، صحيح مسلم بشرح الإمام النووى (٤/ ٩٠).

سوجدە ببەو هەستەوە بۆ رکعەتی دووەم، بەهەما شێوەی رەکعەتی یەکەم تەواوی بکە و لەدوای تەحیات سەلام بدەوە..

ئەمەش لای زۆری تەحیات و سەڵاواتە:

(التحياتُ: المباركاتُ الصلواتُ الطيباتُ لله، السلامُ عليكَ ايها النبيُّ ورحمة الله وبركاتهُ، السلامُ علينا وعلى عباد الله الصالحين، اشهد ان لا اله الا الله، واشهد أن محمداً رسول الله، اللهم صلِّ على محمدٍ عبدكَ ورسولكَ النبيِّ الأميِّ، وعلى آل محمدٍ وازواجه وذريته، كما صليتَ على إبراهيم وعلى آل ابراهيم في العالمين، إنك حميدٌ مجيد، وبارك على محمد و آل محمد وازواجه وذريته كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم في العالمين إنك حميدُ مجيد).

وە هەروەها لای کەمی تەحیات: (التحياتُ لله، السلام عليكَ أيها النبيُّ ورحمة الله وبركاتهُ، سلام علينا وعلى عباد الله الصالحين، اشهد ان لا إله الا الله واشهد ان محمداً رسول الله، اللهم صلّ على محمد وعلى آله وصحبه وسلم).

وە هەروەها دەتوانی پێش سەلام دانەوە دوعا بکەی، وە باشترین دوعا ئەو دوعایانەن کە بیسراون لەحەزرەتی رسول الله (ﷺ) لەوانە: (اللهُمّ اغفرْ لي ماقَدَّمتُ وما أخَرّتُ وما اسْرَرْتُ وما اعْلَنْتُ، وما اسْرَفْتُ وما انت أعْلَمُ مني، أنْتَ المُقَدمُ وأنْتَ المؤخَرُ، لا الهَ الا انْتَ) یان : (اللهُم إني أعُوذُ بِكَ منْ عَذاب القَبْر، ومنْ عَذاب النَّار، ومن فتْنة المَحيا والمَمات ومن فتنة مسيح الدجال).

چەندی توانات هەیە شەونوێژ بکە و هەوڵ بدە قورئـان زۆر بخوێنـە لـەناو نوێـژەکانت و دوعـا زۆربکە لەئاخیری نوێژەکانیشت و (وتر) بکە.

## نوێژی وەتر

یەکێکە لەنوێژە (مؤکد) و زۆر بەخێرەکان ، بۆیە ناوی نراوە وەتر چونکە بەیەك رەکعەت کۆتایی دێت.

لای کەمی وەتر تەنها یەك رەکعەتە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: **(الوتر حَقٌّ على كُلِّ مُسْلِمٍ فمن أحَبَّ ان يُوتِرَ بخَمْسٍ فَلْيَفْعل ومَنْ أحَبَّ انْ يُوتِرَ بثَلاثٍ فَلْيَفْعَلْ ومَن أحَبَّ انْ يُوتِرَ بواحِدةٍ فَلْيَفْعَلْ)**[1]، (سوننەتی وەتر مافێکی راستە لەسەر گشت موسڵمانێك، جا هەرکەسێك پێی خۆشە: بەپێنج رەکعەت وەتر بکا، هەرکەسێك پێی خۆشە بەسێ رەکعەت وەتر بکا، هەرکەسێك پێی خۆشە بەیەك رەکعەت وەتر بکا).

لای کەمی وەتری تەواو سێ رکەعەتە و لای

---

[1] رواه ابو داود بسند صالح.

زۆری لەفــەرموودەی بــەهێزی مەزهەبــدا (١١) رەکعەتە، هەروەکو خاتوو عائیشە (رەزای خـوای لێ بێت) دەیووت: **(کان النبيّ يُصلّي من الليل احدى عَشَرَ ركعةً يُسَلِمُ من كُلّ ركعتين ويُوتر منها بواحِدة)**[1]. (پێغەمبەر (ﷺ) بەشـەو یـانزە رەکعــەتی دەکــردن و لەگــشت دوو رەکعەتێکـدا سـەلامی دەداوەو لـەو یانزەیـە یـەکێکی دەکـردە تاك).

جگە لەمەش، حەوت رەکعەت و نۆ رەکعەتیش لەفــەرموودەی صــحیح هــاتووەو خێرەکەشــی بەگوێرەی زۆرترەکەیەتی.

وە لەفەرموودەیەکی بێهێزدا: لای زۆری وەتـر سـێزدە رەکعەتــە، هــەروەك لەچـەند حەدیـسێکی (بخـاری و مـسلم)دا هـاتووە، بـەڵام فـەرموودەی

---

[1] رواه الشيخان.

بـەهێز وەڵامـی دەداتـەوە: کـە دووانیـان لـەو
سێزدەیە سوننەتی دوای عیشا بووە[1].

مامۆسـتا مـەلا عەبـدالکریمی مـدرس (خـوا
عەفووی بکات) دەفەرمویّ[2]:

لای کەمی نوێژی سوننەتی (وتر) رکاتێك و لای
زۆرووی یازدە رکاتە، لای خواری کەمالیشی سیّ
رکاتە، سوننەتە بۆهەر کەسیّ لەرکاتیّ زیاتر بکا،
لەئاخری هەموو دوو رکاتێکدا تـەحیات بخوێنیّ و
سـەلام بداتـەوە، لـە تاقـە رکاتـە دواییەکەشیا
تەحیات بخوێنیّ و سەلام بداتەوە.

---

(1) روونـاکی رب العـالمین، روونکردنـەوەی (منهـاج الطـالبین
للامام النووي، دانـانی عبـدالله عبـدالعزیز هەرتـەلی، چاپی
سێیەم ١٤٢٤هـ-٢٠٠٤م.

(2) شـەریعەتی ئیسـلام بـەپێی پـەیڕەوی ئیمـامی شـافعی
(١٤٥/١).

# كاتی نوێژی (وتر)

مامۆستا مه‌لا عبدالكريم ده‌ڵێت[1]:

وه‌ختی سوننه‌تی وه‌تر وا له‌به‌ینی نوێژی عیشا و تلوعی فه‌جرا، سوننه‌ته بۆیه‌كێ لای وابێ شه‌و خه‌به‌ری ئه‌بێته‌وه‌و بیه‌وێ شه‌و نوێژ بكا، ئه‌و نوێژه‌ی وه‌تر بخاته پاش شه‌ونوێژه‌وه.

شه‌ونوێژ له‌ئاخیری شه‌و خێری زۆرتره له‌وه‌ی له‌سه‌ره‌تا ده‌یكات، هه‌ركه‌سێ شه‌ونوێژه‌كه‌ی له‌دوای نوێژی عیشا بكات و وه‌تره‌كه‌ش له‌دوای خه‌وتن بكا، ئه‌و خێری زۆرتره، چونكه هه‌م ده‌بێته وه‌ترو هه‌م ده‌بێته (تهجد) هه‌روه‌ك له (تحفه) و (نهايه)دا فه‌رموویانه، پێغه‌مبه‌ر (ﷺ)

---

[1] هه‌مان سه‌رچاوه‌ی پێشوو.

دەفەرمووێ: (مَن خافَ ان لا يقوم من أخرِ الليل فليوتر اوَّلَهُ، ومَن طَمعَ أن يقومَ آخِرهُ فليوتر آخرَ الليل، فأنَّ صلاةَ آخِر الليل مشهودةٌ، وذلكَ أفضَلَ)[1].

(هەرکەسێك بترسێ: کەلە ئاخیری شەودا لەخەو هەڵنەستێ با لەسەرەتای شەودا وەتر بکا، هەرکەسێك بەتەمابوو لەئاخیری شەودا لەخەو هەڵستێ با لەئاخیری شەودا وەتر بکا، چونکە نوێژی ئاخیری شەوێ مەلائیکە ئامادەی دەبن و خێریشی گەورەترە).

[1] رواه مسلم (٧٥٥) صحيح مسلم بشرح الامام النووي (٧١/٤).

ئه‌گه‌ر كه‌سێك دوای عیشا شه‌ونوێژ و وه‌تری كرد، به‌ڵام له‌نیوه‌شه‌و هه‌ڵسایه‌وه بۆ شه‌ونوێژ چی بكات، ئایا وتره‌كه بكاته‌وه، یاخود كلیل دراوه وه‌كو هه‌ندێ ده‌ڵێن؟!

هه‌ركه‌سێ وه‌تری كرد، ئینجا له‌خه‌و هه‌ڵساو (تهجد)ی كرد، دروست نییه وه‌تره‌كه دووباره بكاته‌وه، چونكه دوو وه‌تر له‌شه‌وێكدا نابێ.

## ئه‌ی چی بكات؟!

ئه‌وه‌نده‌ی توانای هه‌یه جووت جووت نوێژ بكات.

وه له فه‌رمووده‌یه‌كی تر هاتووه: وه‌تره‌كه ده‌كاته‌وه جووت به ره‌كعه‌تێكی تر، ئینجا له‌دوای (تهجد) وه‌تره‌كه دووباره ده‌كاته‌وه.

## نوێژی وەتر

دوو رکعەتەکەی وتر، وەکو نوێژی بەیانیە، لەنیەتەکەی دەڵێی (نويت أُصلي ركعتين صلاة الوتر لله تعالى-الله أكبر) (نیەتم وایە دوو رکعەتی وەتر دەکەم بۆ خوای گەورە-الله اكبر).

لەرکعەتی یەکەم لەدوای سوورەتی الفاتحە سوننەتە سورەتی (الأعلى) و لەرکعەتی دووەم لەدوای فاتیحە سوورەتی (الكافرون) بخوێنرێ.

وەلە تاکە وتری کۆتایی، سوننەتە لەدوای سورەتی فاتیحە سورەتەکانی (الاخلاص، الفلق، الناس) بخوێنرێت.

وه‌له‌پاش نوێژه‌كه‌ش سێ جار بڵێ (سبحان الملك القدوس) ئه‌مجار بڵێ (اللَّهُم إني اعُوذُ برضاكَ من سَخَطك، وبمُعافاتكَ من عُقوبَتك، وبكَ منْكَ، لا أُحْصي ثَناءً عَليكَ، أَنْتَ كَما أَثْنَيْتَ على نَفْسكَ، فَلَكَ الْحَمْدُ حَتى تَرْضى، ولَكَ الشُكرُ اذا رَضَيْت)[1].

## صلاة الضُحى- چێشته نوێژ

یه‌كێكه له سوننه‌ته هه‌ره به‌خێره‌كان و پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) كردوویه‌تی و فه‌رمانی به‌هاوه‌ڵه به‌ڕێزه‌كان كردووه بیكه‌ن.

هه‌روه‌كوو (ابو هريره) ده‌یووت: (أوصاني خليلي (صلى الله عليه وسلم) بثلاثٍ: بصيامِ ثَلاثة أيامٍ من كل شَهْرٍ، وَ ركَعَتَي الضُحَّى،وأَنْ أُوترَ قَبْلَ أَنْ أرقُدَ)[2].

(1) شه‌ریعه‌تی ئیسلام (١٤٥/١).

(2) رواه مسلم (٧٢١) صحيح مسلم بشرح الامام النووي (٤١/٤).

واتا (دۆست و خۆشەویستەکەم ئامۆژگاری کردم بەسێ شت کە بیانکەم: هەموو مانگێك سێ رۆژ بگرم[1]، دوو رکعەتی چێشتەنوێژ، پێش پاڵدانەوەم وەتر بکەم).

وە هەروەها لەفەرموودەیەکی قودسی هاتووە، کە خوای گەورە دەفەرمووێت: **(ابن آدم، اركع لي ركعات منْ أول النهار، اكفكَ آخره)**[2] واتا( ئەی نەوەی ئادەم لەسەرەتای رۆژدا چەند جارێك خۆم بۆ بچەمینەوە( نویژ بکە)، منیش کۆتاییەکەت لە کۆڵ دەکەمەوە).

---

(1) کە (١٣-١٤-١٥)ی هەموو مانگێکی ئاسمانیە (ايام البيض).

(2) اخرجه الترمذي (٤٧٥) وله شاهد من حديث نعيم بن همار عند أبي داود (١٢٨٩) صحيح فقه السنة (٤٢١/١).

**چێشته نوێژ:** لای كه‌می دوو ركعه‌ته‌ و لای زۆری (٨) ركعه‌ته‌، هه‌روه‌كوو له‌فه‌رمووده‌یه‌ك هاتووه (عن أم هانيء رضي الله عنها: صلّى النبي (ﷺ) سُبْحَةَ الضُّحى ثمانيَ ركعات)[1]، (پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) هه‌شت ركعه‌ت چێشته نوێژی كرد).

وه‌له فه‌رمووده‌یه‌ك (١٢) ره‌كعه‌ت هاتووه.

## كاتی چێشته نوێژ

كاتی چێشته نوێژ له‌نێوان ئه‌وكاته‌ی رۆژ به‌قه‌د رمێك به‌رز ده‌بێ و تا (زوال)ی ده‌بێ، به‌لام باخێرتره چواریه‌كی رۆژ بڕوا، ئینجا چێشته نوێژ بكا، چونكه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌فه‌رمووێ: (صلاة الأوابين حين تَرْمَضُ الفِصال)[2]، (چێشته

---

[1] رواه مسلم (٣٣٦).

[2] رواه مسلم (٧٤٨).

نوێژ لەوکاتەیە: کە فەرخەی وشتر لەبەر گەرما سمی دەسووتێ).

## چۆن چێشتە نوێژ دەکرێت؟!

لەکاتی نیەت بڵێ: (نويتُ أُصلي ركعتين صلاة الضُحى لله تعالى الله أكبر) (نیەتم ئەوەیە دوو رکعەت چێشتە نوێژ بکەم بۆ خوای گەورە—الله اكبر).

لە رکعەتی یەکەم لەدوای سورەتی فاتیحە سورەتی (الشمس) و لەرکعەتی دووەم لەدوای فاتیحە، سورەتی (الضُحى) بخوێنە.

ئەگەر لەدوو رکعەت زیاترت کرد، ئەوە لەهەموو دوو رکاتێکا سورەتی (الكافرون) و (الاخلاص) بخوێنە.

## صلاة الاستخارة

هەرکەسێك دوو دڵ بوو، ئایا ئەم کارە بکات یان نا، ئەو معامەلە بکات یان نا، ئەم سەفەرە بکات یان نا، ئەم دوکانە بکاتەوە یان نا، شەراکەت لەگەڵ فلانەکەس بکات یان نا..هتد.
لەهەر کاتێك کەوتیە دوودڵی، ئەوە (صلاة الاستخارة) بکە.

## چۆنیەتی صلاة الاستخارە:

دوو رکعەت دەکەی (شەو بێت یان رۆژ) لەنیەت دەڵێی: (نویتُ أُصلي رکعتین صلاة الاستخارة لله تعالی-الله أکبر) (نیەتم وایە دوو رکعەت نوێژی استخارە دەکەم بۆ خوای بالآدەست-الله اکبر).

وەکــو نوێــژی بــەیانی، لــە رکعــەتی دووەم تەحیات دەخوێنی و سـەلام دەدەیـەوەو دەست بەرز بکەو بڵێ:

(اللهمَّ إني أستخيرُك بعلمك واستقدرك بقدرتك وأسألُكَ منْ فَضلك العَظيم فإنكَ تقدر ولا أقدرُ وتعلم ولا أعْلَمْ وأنْتَ علاّمُ الغُيوب، اللهمَ انْ كُنتَ تَعْلَمُ أن هذا الأمْرَ (........) خيرٌ لي في ديني ودُنيايَ ومَعاشي وعاقبة امري عاجله وآجله- فاقْدُرهُ لي ويَسّرهُ لي ثُمّ بارك لي فيه، اللهُمَّ وانْ كنتَ تعلم انّ هذا الامر (........) شَرٌّ لي في ديني ودُنياي ومعاشي وعاقبةِ أمري-عاجله وآجله- فاصرفهُ عنيّ واصرفني عنهُ واقدْر ليَ الخيرَ حيثُ كان ثُمَّ أرضني به)[1].

---

[1] رواه البخاري (١٣٨٣).

ئەم دوعایە بخوێنەو لەشوێنی دوو کەوانەکاندا ناوی کارەکە بڵێ و دڵت بۆکام لا ڕۆیشت إن شاو الله خێر لەوێیە.

ئەم نوێژە جارێك بیکە، ئەگەر ئەنجامی نەبوو بیکە سێ، پێنج، لایەکت هەردەکەوێتە دڵەوە.

بەڵام ئاگاداربە ئەم نوێژە بۆ کردنی (واجب) یان (سُنَّە) هەروەها بۆ نەکردنی کاری (حرام) یان (مکروه) ناکرێ.

هەندێ کەس وادەزانێ پاش ئەنجامدانی ئەم نوێژە خەون دەبینێ، بەڵام شتی وا نییەو مەرج نییە خەون ببینێ.

## صلاة التوبة - نوێژی ته‌وبه‌كردن:

هه‌ركه‌سێك گوناهێكی كرد و ویستی ته‌وبه‌بكات، ئه‌وه ده‌ستنوێژ ده‌گرێت و دوو ركعه‌ت نوێژی ته‌وبه ده‌كات و له‌كاتی نیه‌ت ده‌ڵێ: (**نویتُ أُصلي ركعتين صلاة التوبة لله تعالى-الله أكبر**) (**نیه‌تم ئه‌وه‌یه دوو ركعه‌ت نوێژی ته‌وبه‌كردن ده‌كه‌م بۆ خوای گه‌وره - الله أكبر**).

كه نوێژه‌كه‌ی ته‌واوكرد، ده‌ست به‌رزده‌كاته‌وه‌و داوا له‌خوابكات، كه‌له گوناهه‌كه‌ی خۆش بێت، وه إن شاو الله خوای گه‌وره عه‌فووی ده‌كات.

هه‌روه‌كو ئه‌بوبه‌كری سدیق (رضي الله عنه) ده‌ڵێ: **(سمعت رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يقول: مامن رجل يذنب ذنباً ثم يقوم فيتطهر ثم يُصلي ثم يستغفر الله إلا**

غفر الله لـه) [1]، (گـوێم لـه پێغەمبـەر (ﷺ) بـوو دەیفەرموو: هەرکەسێك گوناهێك بکات پاشان هەڵسێ خۆی پاك بکاتەوەو دەستنوێژ بگرێت و نوێـژ بکـات و پاشان داوای لێخۆشبوون لـەخوا بکـات، ئـەوە خـوای گەورە لێی خۆش دەبێت).

داواکارم خوای گەورە بتانپارێزێـت لـەگوناه، بـەڵام هــەرکاتێك تووشــی گونــاه هــاتن، تەوبــه بکــەن و ئەونوێژه ئەنجام بدەن.

[1] اخرجـه الترمـذي (٤٠٦) وابـو داود (١٥٢١) وابـن ماجـه (١٣٩٥).

## صلاة التسبیح[1]

پێکهاتووە لەچوار رەکعەت و وەختی تایبەتی نیەو لەشەوو رۆژدا دەکرێ.

ئەگەر لەشەو بکرێ واباشە دوو رکعەت دوو رکعەت سەلام بدرێتەوە، بەڵام لەرۆژدا هەرچوار رکعەت بەیەکەوە دەکرێ وەکو نوێژی نیوەڕۆ.

ئەگەر توانات هەبوو، هەموو شەوو رۆژێك بیکە، یان حەفتەی جارێ، یان مانگێ جارێ، یان لەساڵێکدا جارێ، یان لەعومردا جارێ.

---

(1) دەربارەی صلاە التسبیح: ئەو فەرموودەمان هەیە کە ابن عباس دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو نوێژەی فێری (عباس)ی مامی کردووە، بەڵام زۆر لەزانایان بەبێ هێزی دادەنێن.

## چۆنیه‌تی صلاة التسبیح

ئه‌گه‌ر رۆژبێت نیه‌تی چوار ره‌كعه‌ت بێنه‌و ئه‌گه‌ر شه‌و بێت نیه‌تی دوو ركعه‌ت بێنه‌و پاشان دوو ركعه‌ته‌كه‌ی تریش بكه.

له‌نیه‌ت هێنان بڵێ: (نويتُ أُصلي ركعتين صلاة التسبيح لله تعالى-الله أكبر) (نیه‌تم ئه‌وه‌یه دوو ركعه‌ت نوێژی (تسبیح) ده‌كه‌م بۆخوای گه‌وره- الله أكبر).

له‌ركعه‌تی یه‌كه‌م له‌دوای فاتیحه، سوره‌تی (الكافرون) بخوێنه‌و (١٥) جار بڵێ (سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله أكبر) پاشان بڕۆ ركوع له‌پاش ئه‌وه‌ی كه سێ جار وتت (سبحان ربي العظيم وبحمده) ئه‌وه (١٠) جار بڵێ (سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله أكبر)

کــە هەســتایەوە (١٠) جــار بڵــێ و لەهــەر سوجدەیەکدا

دە جار بڵێ و لە دانیشتنی نێوانیاندا (١٠) جار بیڵێ، پێش هەستانەوەت بۆ رکعـەتی دووەم (١٠) جـار بیڵـێ ئینجـا هەڵسەوە بـۆ رکعـەتی دووەم، ئـەویش لـەدوای فاتیحـە سـورەتی (**الاخـلاص**) بخوێنەو وەکو رکعەتی یەکەم زیکرەکان بڵـێ، تـا دەگەیە دانیشتنی کۆتایی، پێش تحیات (١٠) جار بڵێ و ئینجا تحیات بخوێنەو سەلام بدەوە.

کەواتــە، لەهــەر رکعــەتێك (٧٥) جــار دەڵێــی (**سبحان الله والحمد لله ولااله الا الله والله أكبر**)[1].

---

[1] هەرچەند حەدیسەکەی بێ هێزە بـەڵام چـونکە لـەزۆر رێگـەوە هاتووە بووەتە (**حسنٌ لكثرة طُرُقـه**) هـەروەك لـە (**تُحفـة**)دا فەرموویەتی، کەواتە حەدیسەکە رەفتاری پێ دەکرێ.

## صلاة الحاجة (نوێژی داواکاری)

ئەم نوێژە هەروەکو لەناوەکەی دیارە بۆ داواکاری دەکرێت، جا جیاوازی نییە، داواکەت لەخوا بێت یاخود لەخەڵك.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (مَنْ كانتْ لَهُ الى الله حاجة او الى احدٍ من بني آدم فليتوضأ فليحْسِن الوضوءَ ثُمَّ ليُصَلِّ ركعتين ثم ليُثْنِ على الله وليُصَلِّ على النَبي (ﷺ) ثم ليَقُلْ : لا إله الا اللهُ الحليمُ الكريمُ سُبحانَ الله ربِّ العرش العظيم الحمد لله رب العالمين، أسألكَ موجبات رحمتك، وعزائِم مغفرتك، والغنيمةَ من كُلِّ بِرٍّ، والسّلامةَ من كُلِ اثمٍ، لا تَدَعْ لي ذنباً الاّ غفرتَهُ ولا هَمّاً إلا فرَّجْتَهُ، ولا حاجة هي لكَ رضاً الاّ قضيتها يا أرحم الراحمين)[1].

---

[1] رواه الترمذي وابن ماجه بسند حسن (التاج الجامع للاصول في

(هەركەسێ داواكاریەكی لەخوا هەبێ یان لەكەسێك، ئەوە با دەستنوێژێكی باش بشوات و دوو ركعەت نوێژ بكات و پاش تەواوكردنی نوێژەكە دەست بەرز بكات و سوپاس و ستایشی خوا بكات و سەلەوات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لێ بدات و پاشان ئەم دوعایە بخوێنێ، ئەوە إن شاء الله خوای گەورە كارەكەی بۆ ئاسان دەكات (ئەم نوێژە بۆكاری حەرام و كردەوەی ناپەسەند ناكرێ).

## سەلامی مزگەوت ( تحیة المسجد )

هەركاتێ كە ئینسان رۆیشتە مزگەوتەوە دانەنیشێ تا دوو رەكعەت نوێژ ئەكا، ئەم

---

احادیث الرسول (ﷺ) (١/٣٣٦) عن عبدالله بن أبي أوفى (ر).

نوێژەش دووبارە دەبێتەوە بە دووبارە بوونەوەی چوونە مزگەوت.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (**اذا دَخَلَ أحَدُكُم المسجدَ، فلا يَجْلِسْ حَتى يُصلّي ركعتين**)[1]، (هەرکاتێك یەکێکتان چووە ناو مزگەوت با دانەنیشێ تا دوو رکعەت نوێژ دەکا).

لەهەموو کاتێك کە چوویە ناو مزگەوت سوننەتە (**تحية المسجد**) بکەی و ناپەسەندە نەیکا بەئەنقەست و یەکسەر دابنیشێ.

ئەگەر دانیشتی و ئەنجامت نەدا، سوننەت نییە قەزای بکەیەوە، بەڵام ئەگەر بەنەزانی یان لەبیرت چوو دانیشتی، دانیشتنەکەش کەم بوو، یان ماوەیەك بەپێوە راوەستایت، ئەوکاتە (**تحية المسجد**) هەر دەمێنێ و بیکە، بەڵام ئەگەر

---

(1) رواه مسلم (٧١٤).

دانیشتی بەئەنقەست هەڵمەستەوە، هەرکەسێك ئـەم سـوننەتەی بەهـەر هۆیـەك بۆنـەکرا، سوننەتە بڵێ: (سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله أكبر، ولا حَول ولا قوة الا بالله العلي العظيم).

سـوننەتی (تحيـة المـسجد) دێتـەجێ و خێرەکەشی دەگاتێ بەکردنی نوێژێکی واجب، جا ئـەدابێ، یـان بەقـەزابێ، هەرچـەند نیـەتی (تحيـة المـسجد)یـشی لەگەڵـدا نـەهێنێ، یـان بـەکردنی سـوننەتێکی تـر لـە نوێـژە سـوننەتەکان، چـونکە مەبەسـت ئەوەیـە بەنوێـژکردنێك رێـز لەمزگـەوت بگیرێ.

## نوێژی ڕێبوار (قصر و جمع)[1]:

کورت کردنەوەی نوێژی فەرز روخسەتێکە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ موسڵمانان، چونکە سەفەرکردن گرانە و ئینسان ناتوانێ بەئاسانی وەکو لەماڵەوەبێ عیبادەتی بکا.

### ١- کورت کردنەوەی نوێژ (القصر):

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُواْ لَكُمْ عَدُوّاً مُّبِيناً﴾[2].

(هەرکاتێك بەسەفەر بەلایەکی زەویدا ڕۆیشتن، ئەوە گوناهبار نابن بەکورت کردنەوەی نوێژ، (بەتایبەت) ئەگەر ترسان ئەوانەی خوانەناسن

---

[1] قصر: کورت کردنەوەی نوێژی چوار رکعەتی و کردنی بەدوو رکعەت. جمع: کۆکردنەوەی دوو نوێژ لەکاتی یەکێکیاندا.

[2] سورة النساء: ١٠١.

پـیلان و بەڵایـەکتان بەسـەر بهێـنن و ئازارتـان بدەن..).

تـەنها نوێـژە چـوار ڕەکعەتیـەکان کـوورت دەکرێنـەوە بـۆ دوو ڕکعـەت، کەواتـە: نوێـژی مەغریب و بەیانی کورت ناکرێنـەوە. بـەڵام کـورت کردنەوەی نوێژ چەند مەرجێکی هەیە:

## مەرجەکانی کورت کردنەوەی نوێژ

١- سەفەرەکە درێژ بێ:

سـەفەری درێـژ لای ئیمـامی شـافیعی (ﷺ) بریتییە لە (٤٨) میل کەدەکاتە (هەشتاکیلۆمەترو نیو کیلۆمەترو سەدو چل مەتر) یاخود دووقۆناغ.

دەریاو ئاسمانیش وەکو بیابان وایە، هەرکاتێك سەفەرەکەی لە (٨٠)کم تێپەڕی کـرد، دەتـوانی نوێژەکانت کورت بکەیەوە.

ئەگەر بەیەك سەعات هەشتا کیلۆمەترت بڕی

بەتـەیارە نوێـژەکانت هـەر کـورت دەکەیـەوە، سەرەتای سەفەر لەلادانی ڕێبوارەوە دەست پـێ دەکـات لـەئاوەدانی ئـەو شـوێنەی کـە سـەفەری لێـوە دەکـات، کەواتـە لادان لـە کـاول و وێرانـەی دەوری شار یان دێیەکە پێویست نییـە، هـەروەها لادان لەباخات و کێڵگەی کشتوکاڵی ئـەو شـوێنە پێویـــست نییـــە، چـــونکە ئەمانـــە بەنەفـــسی ئاوەدانییەکە ناژمێردرێن.

ئەگـەر خـەڵکی وڵاتـی ڕێبوارەکـە دەوارنـشین بـوون، پێویـستە لابـدا لەخێوەتـەکان و لەشـوێن دانیـــشتنیان کـــە تێیـــدا دادەنیـــشن، کەلـــە سەفەرەکەی گەڕایـەوە، سـەفەرەکەی ئەبڕێتـەوە بەگەیـشتنی بـەو شـوێنەی کەلـەکاتی ڕۆیـشتنیا بەسەرەتای سەفەری دانرابوو.

ئەگەر یەکێك لەماوەی سەفەریدا گەیشتە

شارێك و نییه‌تی مانه‌وه‌ی چوار رۆژ یان زیاتری هێنا له‌وشوێنه‌دا، ئه‌وه سه‌فه‌ره‌كه‌ی ئه‌برێته‌وه به‌گه‌یشتنی به‌وشوێنه، به‌ڵام رۆژی گه‌یشتن و گه‌ڕانه‌وه‌ی هه‌ر به‌رۆژی سه‌فه‌ر بۆ داده‌نرێت.

ئه‌گه‌ر نیازی ماوه‌یه‌كی تایبه‌تیشی نه‌بوو ئه‌یویست هه‌ركاتێك كاره‌كه‌ی جێبه‌جێ بێت، بگه‌ڕێته‌وه، ئه‌وه جگه له‌رۆژی گه‌یشتن و گه‌ڕانه‌وه تا (١٨) رۆژ حه‌قی كورت كردنه‌وه‌ی نوێژی هه‌یه[1].

## ٢- سه‌فه‌ره‌كه حه‌ڵاڵ بێ:

كه‌واته دزو جه‌رده‌و ئه‌وانه‌ی بۆ كاری حه‌ڕام ده‌چن بۆ سه‌فه‌ر حه‌قی كورت كردنه‌وه‌ی نوێژیان نییه، هه‌تا ئه‌گه‌ر كه‌سێك به‌نیازی حه‌ڵاڵ

(1) شه‌ریعه‌تی ئیسلام به‌پێی په‌یڕه‌وی ئیمامی شافیعی (رضي الله عنه) دانراوی م عه‌بدالكریمی مدرس (١/١٢١).

سەفەری کرد و پاشان نیازی گۆڕا بەحەڕام، ئەوە لەکاتی نیاز گۆڕانەکەیەوە بۆی نییە نوێژ کورت بکاتەوە.

**٣- بزانێ بۆ کوێ دەچێ و بشزانێ کەلە (٨٠)کم کەمتر نییە:**

کەوابوو، نوێژ کورت کردنەوەی نییە بۆئەوانەی سەری خۆیان هەڵدەگرن و بەبێ نیازی شوێنێکی دیاری ئەسووڕێنەوە، بەملاو بەولادا.

یاخود کەسێك بەدوای قەرزارێکا یان کەسێکا بگەڕێ کەنەزانێ لەکوێیەو لەهەر لایەك بیدۆزێتەوە بگەڕێتەوە.

وە هەروەها ئەگەر ژن لەگەڵ مێردەکەیا یان کرێکار لەگەڵ خاوەن ئیشا، یان دیل لەگەڵ زۆردارا، یان سوپایێ لەگەڵ سەرلەشکرا چون بۆ سەفەر، ئەوە ئەگەر هەر لەسەرەتاوە ئەیانزانی

کە ئەوسەفەرە دوو قۆناغ ئەبێ، یان چاویان بە گەورەکەیان کەوت نوێژی بەکوورت کراوەیی ئەکرد ئەوە ئەوانیش نوێژ کورتکردنەوەیان بۆ دروستە.

**٤- نابێ نوێژەکەی بەجەماعەت لەپشت ئیمامێکی وەها بکا: کە نوێژەکەی تەواو بکا:**

ئەگەر ئیقتیدای پێ کرد، ئەوە دەبێ نوێژەکەی تەواو بکات، بۆیە دروست نییە، چونکە تۆ ڕێبواری و نوێژەکەت کورت دەکەیتەوە، بەلاّم ئیمامەکە نوێژەکەی کورت ناکاتەوە.

**٥- نیەتی کورت کردنەوەی نوێژ:**

لەگەڵ (الله أكبر)ی نوێژ دابەستندا، نیەتی کورت کردنەوە بێنە.

### ٦- خۆپاراستن لەگشت ئەو کارانەی دژی نیەتی کوورتکردنەوەن:

ئەگەر نییەتی کورت کردنەوەی هێناو لەپاشان دوودڵ بوو لەوەدا کەوا بەکوورتی بیکات یان بەتەواوی، یان کەوتە شکەوە لەخۆیا، ئاخۆ نییەتی کورت کردنەوەی بووە یان نا، یان ئیمامەکەی هەستایەوە بۆ رکعەتی سێیەم و ئەمیش کەوتە شکەوە ئاخۆ ئیمام نوێژەکەی بەتەواوی ئەکا یان بەکورتی، یان ئەم هەستانەوەیە بەعەمدی یان بەسەهووە، پێویستە لەهەموو ئەمانە نوێژەکەی بەتەواوی بکات.

### ٧- دەبێ لەهەموو نوێژەکەیدا رێبوار بێ:

دەستکرا بەنوێژ، بەڵام کەگەیشتە رکعەتی دووەم تەیارەکە یاخود کەشتیەکەی گەیشتەوە وڵات (ماڵ) ئەوە دەبێ نوێژەکەی تەواوبکات، چونکە هۆی کورتکردنەوەکەی نەماوە.

## ٨- دەبێ ئاگاداربین لە کورتکردنەوەی نوێژ:

کەسی نەزان ئەگەر لەخۆیەوە نییەتی کورت کردنەوەی نوێژی هێنا، ئەوە نوێژەکەی دانامەزرێ.

**ئاگاداریە...**

ئەگەر سەفەرەکە گەیشتە سێ قۆناغ (١٢٠) کیلۆمەتر، ئەوە کورتکردنەوەی نوێژ خێری گەورەترە لەتەواوکردنی، چونکە بەزۆری پێغەمبەر (ﷺ) و (الخلفاء الراشدین) لەسەفەرە درێژەکانیدا کورتیان کردۆتەوە.

## چۆنیەتی ئەنجامدانی نوێژی (قصر)

ئەگەر ویستت نوێژی نیوەڕۆو عەسر بەیەکەوە بکەی:

١- سەرەتا نوێژی نیوەڕۆ دەکەیتو لە نیەتدا دەڵێی: (**نَوَیتُ صلاةَ الظهرِ رکعَتَینِ قصراً للهِ تعالی، اللهُ أکبَر**)

**(نیەتم وایە نوێژی نیوەڕۆ دەکەم، دوو رەکعەت بە کورتکراوەیی بۆ خوای باڵا دەست، الله أكبر)**

لە دوای فاتیحە سورەتێك دەخوێنیو وەکو نوێژی بەیانی دوو رەکعەت دەکەیتو سەلام دەدەیەوە. پاشان ...... یەکسەر نوێژی عەسر دەکەیو دەڵێی: (**نَوَیتُ صلاةَ العَصرِ رکعَتَینِ قصراً وتَقدیماً للهِ تعالی، اللهُ أکبَر**) (نیەتم ئەوەیە نوێژی عەسر دەکەم دوو رەکعەت بە کورتکراوەییو پێشخستن بۆ خوای گەورە الله

أكبر) دوو ڕەکعەت دەکەیتو سەلام دەدەیەوە.

**٢- کۆکردنەوەی نوێژ (جمع)**

دروستە کۆکردنەوەی نوێژی نیوەڕۆو عەسرو، مەغریبو عیشا بەم جۆرە کە هەردوو نوێژەکە لە کاتی یەکەمیانا، یان لە کاتی دووهەمیان بکا **(دەتوانی عەسر لەگەڵ نیوەڕۆ بکەی، یان نیوەڕۆ ببەیە لای عەسرو بەیەکەوە بیکەو، عیشا لەگەڵ مەغریب بکە یان مەغریب ببە لای عیشا)**.

هەروەکو ئیبن عباس (رضي الله عنه) دەڵێت: **(أَنَّ النَّبِي (صلى الله عليه وسلم) جَمَعَ بينَ الصلاةِ في سفرةٍ سافَرناها في غَزوَةِ تَبوك، فَجَمَعَ بيَنَ الظُهرِ وَالعَصر، وَالمَغرِبِ وَالعشاء)**[1]. واتا (لە شەڕی تەبوك، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نوێژی کۆکردەوە، نوێژی نیوەڕو عەسرو نوێژی مەغریبو عیشا).

---

[1] رواه مسلم (٧٠٥).

کـەوابوو: کورتکردنـەوەی نوێـژ دەبێتـە دوو بەش:

أ- پێشخستنی نوێژی دووەم (جمع التقديم).
ب- دواخستنی نوێژی یەکەم (جمع التأخير).

**أ- پێشخستنی نوێژی دووەم (جمع التقديم).[1]**

بە (٣) مەرج دەکرێ:

١- سەرەتا نوێژی یەکەم بکات پاشان دەست بە دووەم بکات (ئەگەر نوێژی عەسر لەگەڵ نیوەڕۆ بکات، ئەوە سەرەتا نیـوەڕۆ دوو رەکعـەت بکـات ئەوجا دوو رەکعەتی عەسریش بکات).

٢- هەر لە کاتی نوێژی یەکەمەوە یان لە پێش تـەواو بوونیـدا نیـەتی کۆکردنـەوەی هـەردوو نوێژەکەی هەبێ.

٣- ئـەو دوو نوێـژە یـەك لـە دوای یـەك بـنو

---

[1] نوێژی عەسر لەگەڵ نیوەڕۆ بکەیو عیشاش لەگەڵ مەغریب.

بەینیان زۆر نەبێت. هەروەکو جابر (رضي الله عنه) دەڵێ:

(في صفة وقوف رسول الله (صلى الله عليه وسلم) بعرفات: ثُمَّ أذَّنَ ثُمَّ أقامَ فصلَّى الظُهرِ، ثُمَّ أقامَ فَصَلَّى العَصرَ ولَمْ يُصَلِّ بَينَهُما شَيئاً) [1].

واتا(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە (حجة الوداع) دا کە لە (عرفات) دا بانگی نیوەڕۆ دراو ئیقامەت کرا نوێژی نیوەڕۆی کرد، ئینجا دووبارە ئیقامەت کراو نوێژی عەسری بە (جمع التقديم) کردو، هیچ سوننەتێکی لە نێوان هەردوو نوێژەکاندا نەکرد).

## ب- دواخستنی نوێژی یەکەم (جمع التأخير) [2].

بۆ دروست بوونی (جَمع التأخير) دوو شت واجبن:

---

[1] رواه مسلم

[2] نوێژی نیوەڕۆ لەگەڵ عەسر بکات، یان نوێژی مەغریب لەگەڵ نوێژی عیشا بکات.

١- دواخستنی نوێژی یەکەم بەنیەتی (جَمع التأخیر) بێ، بۆ ئەوەی جیاوازی هەبێ لەگەڵ ئەو کەسەی بە گوناهکاری نوێژەکە دوا دەخا، بەو مەرجەی نیەتەکە لەکاتی نوێژەکە بێ.

٢- دەبێ ڕێبوارەکە هەر لە سەفەر بێ لە کاتی نیەت هێنانی دواخستنی نوێژەکە، تا هەردوو نوێژەکە تەواو دەبن.

کەسێك ویستی مەغریب لەگەڵ عیشا بکات بە (جَمع التأخیر) ودەستی بە نوێژی مەغریب کرد کە تەواو بوو، تەیارەکەی گەیشتەوە ماڵ، ئەوە نوێژی عیشا بە تەواوی دەکاتو نوێژی یەکەمیشی دروستە.

**ئاگاداربه‌........**

له‌ (جَمع التأخير) ڕێزكردن واجب نیه‌، واتا:
واجب نیه‌ نوێژی یه‌كه‌م له‌ پێشدا بكه‌ی‌و، هه‌روه‌ها واجب نیه‌: یه‌كسه‌ر نوێژی دووه‌م له‌ دوای یه‌كه‌مدا بكه‌ی‌و هه‌روه‌ها واجب نیه‌ نیه‌تی (جَمع التأخير) له‌ دابه‌ستنی نوێژی یه‌كه‌مدا بهێنی، به‌ڵكو ئه‌و سێیانه‌ گشتیان سوننه‌تن[1].

## چه‌ند ڕه‌وشتێكی سه‌فه‌ر

١- هه‌ر كه‌سێك ویستی سه‌فه‌ر بكات، سوننه‌ته‌: ڕاوێژ به‌ مرۆڤی لێزان‌و دیندار بكاو نوێژی (الإستِخَارَة) بكاو گه‌رده‌نی خۆی به‌ خاوه‌ن مافان ئازاد بكاو مافه‌كان بداته‌وه‌و دڵی دایك‌و باوكی ڕازی بكاو خوا حافیزی له‌ خزم‌و

---

[1] ڕوناكی ربّ العالمين ڕوونكردنه‌وه‌ی (منهاج الطالبين لِلإمام النووي) دانراوی عبدالله عبدالعزيز هه‌رته‌لی. (٢٢/٤).

کەس‌و جیران‌و دۆست‌و برادەر بکاو هەردوو لا ئەم دوعایە بۆ یەکتری بکەن (اسـتَودَعُ اللهَ دينَـكَ وَأمانَتَكَ وَ خَواتِمَ عَمَلَكَ).

٢- سوننەتە: ڕۆژی پێنج شەممە، یان دوو شەممە دەست بە ڕۆیشتن بکاو، پێش ئەوەی لە ماڵ بڕواتە دەرەوە دوو ڕەکعەت بە نیەتی (سنة السفر) لە ماڵەوە بکا، ئینجا لە دوای سەلام دانەوە (آيـة الكرسـي)[1]. و (لإيـلافِ قُـرَيش)[2]. بخوێنێ، ئینجا لەکاتی چوونە دەرەوە بڵێ: (بِسمِ اللهِ تَوكَلتُ على اللهِ وَلا حَولَ وَلا قُوةَ إلا باللهِ).

ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەڵێ: هەر کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نیازی سەفەری هەبوایە، لە

---

(1) هاتووە: ئەوەی پێش دەرچوونی لە ماڵ (آية الكرسي) بخوێنێ، هیچ زیانی پێ ناگات، تا دەگەڕێتەوە.

(2) ابو الحسن القزويني دەڵێ: دەپارێزێت لە هەموو خراپەیەك.

كاتی هەڵسان بۆ ڕۆیشتن دەیفەرموو: (اللهُمَّ إِلَيكَ تَوَجَهْتُ، وَبِكَ اعتَصَمتُ، اللهُمَّ أكفني ما هَمَّني وَما لا اهتَمُّ لَهُ، اللهُمَّ زَوِّدني التَّقوى، وَاغفِر لي ذَنبي وَوَجِّهني للخَير أينَما تَوَجَّهْتُ).

ئینجا كە ویستی سواری ئۆتۆمبیل، كەشتی، تەیارە .......هتد. ببێ بڵێ (بِسمِ اللهِ) ئەوجا (٣) جار بڵێ (اللهُ أكبر) پاشان بڵێ (سُبحانَ الَّذي سَخَّرَ لَنَا هَذا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنينِ* وَإنَّا إلى رَبِّنا لَمُنقَلِبون)[1] (اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِي سَفَرنا هَذا البِرَّ وَالتَّقوَى، وَمِنَ العَمَلِ مَا تَرْضى، اللهُمَّ هَوِّن عَلَيْنَا سَفَرَنا هَذا واطوِ عَنَّا بُعْدَهُ، اللهُمَّ أنتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالخَليفَةُ فِي الأهلِ، اللهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وكَآبَةِ المَنْظَرِ، وَسُوءِ المُنْقَلَبِ فِي

---

(1) سورة الزخرف: ١٣ — ١٤ .

المَال وَالأهل)[1].

٣- لــە کــاتی ســەرکەوتن لــە بەرزاییــەکان سوننەتە بڵێـی (اللهُ أكبر) و لـەکاتی دابـەزین لـە بەرزاییەکان بڵێی (سُبحانَ الله) بەڵام دەنگی بـەرز نەکاتەوە.

٤- ئەگـەر چاوی بـە شـارێك کـەوت، ویـستی بچێتە ناوی یاخود نـا، سوننەتە بڵـێ: (اللَّهُمَّ رَبَّ السَّماوات السَّبْع وَمَا أظْلَلْنَ، وَرَبَّ الأرَضينَ السَّبْعِ وَمَا أقْلَلْنَ، وَرَبَّ الشَّيَاطِين وَمَا أضْلَلْنَ، وَرَبَّ الرِّيَاحِ وَمَا ذَرَيْنَ، أسألُكَ خَيْرَ هَذه القَرْيَة وَخَيْرَ أهلها، وَخَيْرَ مَا فيهَا، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا، وَشَرِّ أهْلِهَا، وَشَرِّ مَا فِيهَا)[2].

---

[1] رواه مسلم (١٣٤٢) – باب: ما يقول إذا ركب الى سفر الحج وغيره (٥/٢٤٠).

[2] رواه إبن السني (٥٢٥)، وحسنه الحافظ والألباني رحمهما الله،الأذكار المنتخب من كلام سيد الأبرار - للإمام أبي زكريا

٥- ئەگەر لە شوێنێك دابەزی بڵێ (**أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ**)[1]. ئەوە سەلامەت دەبێ تا دەگەڕێتەوە.

٦- هەرکاتێك کارو پێویستیەکانی پێك هات، سوننەتە: بە پەلە بگەڕێتەوە ناو ماڵو خێزانی خۆیو سوننەتە دیاری یەکیش لەگەڵ خۆی بێنێ بۆ ماڵو منداڵەکانی.

٧- کە چاوی بە گوند - شارەکەی خۆی دەکەوێت سوننەتە بڵێ: (**اللَّهُمَّ اجْعَلْ لَنَا بِهَا قَراراً**

يحيى بن شرف النووي تحقيق: طه عبدالرؤوف سعد- الطبعة الأولى (١٤٢٢هـ - ٢٠٠١م) مكتبة الصفا.

[1] لەو فەرموودە وەرگیراوە کە ئیمامی موسلیم ریوایەتی کردووە (٢٧٠٨).

وَرِزْقَاً حَسَناً)[1].

ئینجا تا دەگاتەوە جیّ بەردەوام بلّیّ: (آيِبُونَ، تَائِبُونَ، عَابِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ)[2].

ئینجا پـێش ئـەوەی بڕواتـە نـاو مـاڵی خـۆی سوننەتە: بڕواتە نزیکترین مزگەوتو دوو ڕەکعەت نوێـژ لـەناو مزگەوتـدا بکـا بـە نیـەتی سـوننەتی گەڕانەوە ئەوجا بڕواتە ماڵەوە.

ئینجا سوننەتە زیافەتێك بکا کە پێی دەوترێـت (النَّقيعة) بە بۆنەی گەڕانەوە.

---

[1] الأذكار- للإمام أبي زكريا يحيى بن شرف النووي: ٢٥٧.
[2] رواه مسلم (١٣٤٢).

## سوننه‌تی ده‌ستنوێژ (سنة الوضوء)

هه‌ركاتێ كه‌سێك ده‌ست نوێژی گرت، به‌دوای ئه‌و ده‌ستنوێژه‌دا دوو ڕه‌كعه‌ت نوێژ بكا به‌ نیه‌تی سوننه‌تی ده‌ستنوێژ، ئه‌وجا وه‌كو نوێژی به‌یانی دوو ڕه‌كعه‌ت نوێژ بكات‌و سه‌لام بداته‌وه‌.

## صلاة الأوابين[1].

له‌ نێوان نوێژی مه‌غریب‌و عیشادا ده‌كرێت، لای كه‌می چوار، شه‌ش ڕه‌كعه‌ته‌و لای زۆری بیست ڕه‌كعه‌ته‌، هه‌موویان دوو ره‌كعه‌ت دوو ره‌كعه‌ت ده‌كرێ.

له‌ نیه‌تدا ده‌ڵێی (نويتُ أُصَلي سُنة صَلاة الأوابين ركعتين لله تعالى، الله أكبر) (نیه‌تم وایه‌ دوو ره‌كعه‌ت سوننه‌تی أوابين ده‌كه‌م بۆ خوای گه‌وره‌ – الله أكبر)

---

[1] به‌ چێشته‌ نوێژیش ده‌گوترێ.

لە ڕەکعەتی یەکەم لە دوای سورەتی فاتیحە (الكـافِرُون) و لــە ڕەکعــەتی دووەم لــە دوای فاتیحە سورەتی (الإخلاص) بخوێنە.

## نوێژی ڕۆژهەڵاتن (صلاة الاشراق)

کاتێك ڕۆژ بەقەد ڕمێك بەرز بۆوە دوو ڕەکعـەت بە نیەتی (سنة الاشراق) سوننەتە، ئەمەیان جگـە لە (صلاة الضُّحى) یە.

### ب–ئەو سوننەتانەی کاتی دیاریکراویان نیە

هیچ بەربەسـتێك دانەنـدراوە بـۆ سـوننەتی بـێ ناو، واتـە: ئـەو سـوننەتەی کـاتو هـۆی نیـە، لـە شـــەرعدا ژمـــارەی بـــۆ دانەنـــدراوەو ژمـــارەی ڕەکعەتەکانیشی دانەندراوە (عَـنْ ثَوبـان (ﷺ) : قال النبِي (ﷺ) عَلَيْكَ بِكَثْرَةِ السُّجود لله– تعـالى – فَإنَّكَ لا تَسْجُدُ لله سَجدَةً إلاّ رَفَعَكَ اللهُ بِها دَرَجَةً

## سوننه‌تی ده‌ستنوێژ (سنة الوضوء)

هه‌ركاتێ كه‌سێك ده‌ست نوێژی گرت، به‌دوای ئه‌و ده‌ستنوێژه‌دا دوو ڕه‌كعه‌ت نوێژ بكا به‌ نیه‌تی سوننه‌تی ده‌ستنوێژ، ئه‌وجا وه‌كو نوێژی به‌یانی دوو ڕه‌كعه‌ت نوێژ بكات‌و سه‌لام بداته‌وه‌.

## صلاة الأوابين[1].

له‌ نێوان نوێژی مه‌غریب‌و عیشادا ده‌كرێت، لای كه‌می چوار، شه‌ش ڕه‌كعه‌ته‌و لای زۆری بیست ڕه‌كعه‌ته‌، هه‌موویان دوو ره‌كعه‌ت دوو ره‌كعه‌ت ده‌كرێ.

له‌ نیه‌تدا ده‌ڵێی (نويتُ أُصَلي سُنة صَلاة الأوابين ركعتين لله تعالى، الله أكبر) (نیه‌تم وایه‌ دوو ره‌كعه‌ت سوننه‌تی أوابين ده‌كه‌م بۆ خوای گه‌وره‌ – الله أكبر)

---

[1] به‌ چێشته‌ نوێژیش ده‌گوترێ.

لە رەکعەتی یەکەم لە دوای سورەتی فاتیحە (الكـافِرُون) و لـە رەکعـەتی دووەم لـە دوای فاتیحە سورەتی (الإخلاص) بخوێنە.

## نوێژی ڕۆژهەڵاتن (صلاة الاشراق)

کاتێك ڕۆژ بەقەد ڕمێك بەرز بۆوە دوو رەکعـەت بە نیەتی (سنة الاشراق) سوننەتە، ئەمەیان جگـە لە (صلاة الضُّحى) یە.

### ب–ئەو سوننەتانەی کاتی دیاریکراویان نیە

هیچ بەربەستێك دانەنـدراوە بـۆ سـوننەتی بـێ ناو، واتـە: ئـەو سـوننەتەی کـاتو هـۆی نیـە، لـە شـــەرعدا ژمـــارەی بـــۆ دانەنـــدراوەو ژمـــارەی رەکعەتەکانیشی دانەندراوە (عَنْ ثَوبـان (ﷺ) : قال النبي (ﷺ) عَلَيْكَ بِكَثْرَةِ السُّجود لله– تعـالى – فَإِنَّكَ لا تَسْجُدُ لله سَجدَةً إلاّ رَفَعَكَ اللهُ بِهَا دَرَجَةً

**وَحَطَّ عَنْكَ بِها خَطيئَة)**[1]. (زۆر سوجدە ببە (مەبەستی نوێژە) بۆ خوای گەورە، چونکە هەر سوجدەیەك بۆ خوا ببەی خوای گەورە پلەیەکت بەرز دەکاتەوە، خراپەیەکیشت لێدەسڕێتەوە).

کەوابوو: تۆ بەکەیفی خۆتی، حەزدەکەی رەکعەتێك بکە، یان سەد، هەزار، جیاوازی نیە شەو بێ یا ڕۆژ، تەنها لەو پێنج کاتانە نەبێ کە نوێژیان تێدا ناپەسندە بە ناپەسندەیەکی حەڕام کە ئەوانیش:

١- لەوکاتەی ڕۆژ هەڵدێ.

٢- کە ڕۆژ لە ناوەندی ئاسمانە.

٣- کە ڕۆژ خەریکی ئاوا بوونە.

٤- لە پاش نوێژکردنی بەیانی تا ڕۆژ هەڵدێ

---

(1) لە پێشدا باس کراوە.

به‌قه‌د ڕمێكیش به‌رز ده‌بێ.

٥- له‌ پاش نوێژكردنی عه‌سر تا ڕۆژ به‌ ته‌واوی ئاوا ده‌بێ.

## دووه‌م: ئه‌و سوننه‌تانه‌ی خێر تره‌ به‌ جه‌ماعه‌ت بكرێن

### ١- نوێژی ته‌راویح :

ئـه‌م نوێـژه‌ لـه‌ مـانگی ڕه‌مـه‌زانی سـاڵی دووی كۆچیدا دامـه‌زراوه‌، حـه‌زره‌ت (ﷺ) لـه‌ شـه‌وی بیـستوسێ‌و بیـستوپێنج‌و بیـستو حـه‌وتی ڕه‌مـه‌زان، هه‌شـت ڕه‌كعـه‌ت تـه‌راویحی بـه‌ دوو ڕه‌كعـه‌ت دوو ڕه‌كعـه‌ت له‌گـه‌ڵ ئه‌سـحابه‌كان كردووه‌.

هه‌رچـه‌نده‌ پێغه‌مبـه‌ر (ﷺ) ئـه‌م چـه‌ند ڕه‌كعه‌ته‌ی به‌ شێوه‌ی ئیمامـه‌ت نـه‌ده‌كرد، بـه‌ڵام ئه‌سحابه‌كان ئیقتیدایان پێده‌كردو ئه‌ویش ڕێی

**وَحَطَ عَنْكَ بِهَا خَطِيئَة)**[1]. (زۆر سوجدە ببە (مەبەستی نوێژە) بۆ خوای گەورە، چونكە هەر سوجدەیەك بۆ خوا ببەی خوای گەورە پلەیەكت بەرز دەكاتەوە، خراپەیەكیشت لێدەسڕێتەوە).

كەوابوو: تۆ بەكەیفی خۆتی، حەزدەكەی رەكعەتێك بكە، یان سەد، هەزار، جیاوازی نیە شەو بێ یا ڕۆژ، تەنها لەو پێنج كاتانە نەبێ كە نوێژیان تێدا ناپەسندە بە ناپەسندەیەكی حەڕام كە ئەوانیش:

١- لەوكاتەی ڕۆژ هەڵدێ.

٢- كە ڕۆژ لە ناوەندی ئاسمانە.

٣- كە ڕۆژ خەریكی ئاوا بوونە.

٤- لە پاش نوێژكردنی بەیانی تا ڕۆژ هەڵدێ

---

[1] لە پێشدا باس كراوە.

بەقەد ڕمێکیش بەرز دەبێ.

٥- لە پاش نوێژکردنی عەسر تا ڕۆژ بە تەواوی ئاوا دەبێ.

## دووەم: ئەو سوننەتانەی خێر ترە بە جەماعەت بکرێن

### ١- نوێژی تەراویح :

ئەم نوێژە لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی دووی کۆچیدا دامەزراوە، حەزرەت (صلى الله عليه وسلم) لە شەوی بیست‌وسێ‌و بیست‌وپێنج‌و بیست‌و حەوتی ڕەمەزان، هەشت ڕەکعەت تەراویحی بە دوو ڕەکعەت دوو ڕەکعەت لەگەڵ ئەسحابەکان کردووە.

هەرچەندە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەم چەند ڕەکعەتەی بە شێوەی ئیمامەت نەدەکرد، بەڵام ئەسحابەکان ئیقتیدایان پێدەکردو ئەویش ڕێی

لێ نەدەگرتن.
لەمەوە جەماعەت لە تەراویحا بووە بە سوننەت، پاشی ئەم سێ شەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەئەهات بۆ مزگەوت، کە پرسیاریان کرد دەربارەی نەهاتنی، فەرمووی: ترسام فەرز بکرێ لەسەرتان.
لە ڕیوایەتێکا هەیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ماڵی خۆیدا بیست ڕەکعەت تەراویحی کردووە.
ئیتر بەم وەزعە مایەوە تا ساڵێکیش لە خەلافەتی ئیمامی عومەر (رضي الله عنه) تێپەڕی.
ئەوە بوو ئیمامی عومەر (رضي الله عنه) لە ساڵی دووەمی خەلافەتی خۆیدا فەرمووی: تازە ئێمە ترسی واجب بوونی نوێژی تەراویحمان نیە، کەواتە با هەمووی بە جەماعەت بکەین لە مزگەوتا، وەك ئەو چەند شەوەی زەمانی

حـەزرەت، ئـەوە باشـترە، چـونکە موسـڵمانان بەم جۆرە ئەم عیبادەتەیان جـوانتر بـۆ دەکـرێو ئارەزووی زیندووکردنـەوەی شـەوانی ڕەمـەزانیان زیاتر دەبێ.

لە بەر ئەوە فەرمانی دا بە (أبيّ بن كعب) کـە پـێش نوێـژ بـۆ پیـاوان بکـاتو فـەرمانی کـرد بـە (سليمان بن حثمه) پێش نوێژ بۆ ئافرەتان بکات.

بەم شێوەیە نوێژی تەراویح کـرا بـە جەماعـەت لە مەدینەو لە شارەکانی تری ئیسلامیشدا دەنگی دایەوەو هەموو ئەسحابەکان قایل بوون بـەوە کـە تەراویح بە جەماعەت بکرێو بوو بە (إجماع).

هـەتاوەکو حـەزرەتی عوسمـان (رضي الله عنه) دوعـای خێری کرد بۆحەزرەتی عومەر (رضي الله عنه)و فـەرمووی: (خوا دڵی نوورانی بکا وەك مزگەوتەکانمانی بەم

لێ نەدەگرتن.

لەمەوە جەماعەت لە تەراویحا بووە بە سوننەت، پاشی ئەم سێ شەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەئەهات بۆ مزگەوت، کە پرسیاریان کرد دەربارەی نەهاتنی، فەرمووی: ترسام فەرز بکرێ لەسەرتان.

لە ڕیوایەتێکا هەیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ماڵی خۆیدا بیست ڕەکعەت تەراویحی کردووە.

ئیتر بەم وەزعە مایەوە تا ساڵێکیش لە خەلافەتی ئیمامی عومەر (رضي الله عنه) تێپەڕی.

ئەوە بوو ئیمامی عومەر (رضي الله عنه) لە ساڵی دووەمی خەلافەتی خۆیدا فەرمووی: تازە ئێمە ترسی واجب بوونی نوێژی تەراویحمان نیە، کەواتە با هەمووی بە جەماعەت بکەین لە مزگەوتا، وەك ئەو چەند شەوەی زەمانی

حەزرەت، ئەوە باشترە، چونکە موسڵمانان بەم جۆرە ئەم عیبادەتەیان جوانتر بۆ دەکرێ‌و ئارەزووی زیندووکردنەوەی شەوانی ڕەمەزانیان زیاتر دەبێ.

لە بەر ئەوە فەرمانی دا بە (أبيّ بن كعب) کە پێش نوێژ بۆ پیاوان بکات‌و فەرمانی کرد بە (سليمان بن حثمه) پێش نوێژ بۆ ئافرەتان بکات.

بەم شێوەیە نوێژی تەراویح کرا بە جەماعەت لە مەدینەو لە شارەکانی تری ئیسلامیشدا دەنگی دایەوەو هەموو ئەسحابەکان قایل بوون بەوە کە تەراویح بە جەماعەت بکرێ‌و بوو بە (إجماع).

هەتاوەکو حەزرەتی عوسمان (رضي الله عنه) دوعای خێری کرد بۆحەزرەتی عومەر (رضي الله عنه)و فەرمووی: (خوا دڵی نوورانی بکا وەك مزگەوتەکانمانی بەم

نوێژە نوورانی کرد) [1].

نوێـژی تـەراویح یەکێکـە لـە نوێـژە بـەخێرو پاداشتەکان، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (مَـنْ قامَ رَمَضان إيماناً وَاحتِساباً غفرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِـنْ ذَنبِـهِ) [2] واتـا (هـەر کەسـێ شـەوانی ڕەمەـزان زینـدوو بکاتـەوە (تـەراویح بکـات) بـە بڕوایـەکی تەواو ئومێدی پاداشتی هەبێ، ئەوە خوای گەورە لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت).

## کەی دەست پێ دەکات و چەند ڕەکعەت بکەین؟!

کاتی تەراویح لە دوای کردنی نوێـژی عیـشاوە دەست پێ دەکاو، تا دەرکەوتنی بەیان کاتەکەی دەمێنێ.

---

(1) شەریعەتی ئیسلام (١/ ١٥٠).

(2) رواه مسلم (٧٥٩).

ژماره‌ی ته‌راویح بیست ره‌كعه‌ته‌و [1] واجبه له گشت دوو ره‌كعه‌تدا نیه‌تی ته‌راویح، یان شه‌و نوێژی ڕه‌مه‌زان بێنێ‌و، له دوای ته‌حیات سه‌لام بداته‌وه.

وه له حه‌دیسێكی تری (صحیح) دا: هه‌شت ره‌كعه‌تیش ژماره‌ی ته‌راویح هاتووه (عَنْ جابر (رضي الله عنه) صَلّى بِنا رَسُولُ الله (صلى الله عليه وسلم) في رَمضان ثمانِ ركعاتٍ ثُمَّ أوتر) [2]. (پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) له مانگی ڕه‌مه‌زاندا هه‌شت ره‌كعه‌تی به جه‌ماعه‌ت له گه‌ڵدا كردین، ئینجا وه‌تری كرد) [3].

---

[1] له‌م ژماره‌یه زیاتر دروست نیه، ته‌نها بۆ دانیشتوانی (مه‌دینه) ی پیرۆز دروسته سی‌وشه‌ش ره‌كعه‌ت ته‌راویح بكه‌ن.

[2] رواه إبن خزيمة وإبن حبان في صحيحيهما.

[3] به‌ڵام وه‌ڵامی ئه‌وه دراوه‌ته‌وه: كه ده‌گونجێ پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) له ماڵه‌وه بیست ره‌كعه‌ته‌كه‌ی ته‌واو كردبێ.

نوێژە نوورانی کرد) (١).

نوێـژی تـەراویح یەکێکـە لـە نوێـژە بـەخێرو پاداشتەکان، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (مَـنْ قامَ رَمَضان إيماناً وَاحتِساباً غفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِـنْ ذَنبِـهِ) (٢) واتـا (هـەر کەسـێ شـەوانی ڕەمـەزان زینـدوو بکاتـەوە (تـەراویح بکـات) بـە بڕوایـەکی تەواو ئومێدی پاداشتی هەبێ، ئەوە خوای گەورە لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت).

## کەی دەست پێ دەکات و چەند ڕەکعەت بکەین؟!

کاتی تەراویح لە دوای کردنی نوێـژی عیـشاوە دەست پێ دەکاو، تا دەرکەوتنی بەیان کاتەکەی دەمێنێ.

---

[1] شەریعەتی ئیسلام (١/١٥٠).

[2] رواه مسلم (٧٥٩).

ژمارەی تەراویح بیست رەکعەتەو [1] واجبە لە گشت دوو رەکعەتدا نیەتی تەراویح، یان شەو نوێژی ڕەمەزان بێنێو، لە دوای تەحیات سەلام بداتەوە.

وە لە حەدیسێکی تری (صحیح) دا: هەشت رەکعەتیش ژمارەی تەراویح هاتووە (عَنْ جابر (ﷺ) صَلّى بِنا رَسُولُ الله (ﷺ) في رَمضان ثمانِ ركعاتٍ ثُمَّ أوتر) [2]. (پێغەمبەر (ﷺ) لە مانگی ڕەمەزاندا هەشت رەکعەتی بە جەماعەت لە گەڵدا کردین، ئینجا وەتری کرد) [3].

---

(1) لەم ژمارەیە زیاتر دروست نیە، تەنها بۆ دانیشتوانی (مەدینە)ی پیرۆز دروستە سی‌وشەش رەکعەت تەراویح بکەن.

(2) رواه إبن خزيمة وإبن حبان في صحيحيهما.

(3) بەڵام وەڵامی ئەوە دراوەتەوە: کە دەگونجێ پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵەوە بیست رەکعەتەکەی تەواو کردبێ.

## چۆنیەتی نوێژی تەراویح

دوو رەکعەت دوو رەکعەت سەلام دەدەیەوە، لە کاتی نیەت هێنان دەڵێی: (نويتُ أُصَلي رَكْعَتَيْنِ صَلاةَ التَّراويحِ – قيام الليل – للهِ تَعالى، الله أكبر). (نیەتم وایە دوو رەکعەت نوێژی تەراویح دەکەم بۆ خوای گەورە الله أكبر).

وەکو نوێژی بەیانی دوو رەکعەت دەکەیتو پاش تەحیات سەلام بدەوەو بەم شێوەیە نوێژەکانی تر تەواو دەکەیت[1].

لە پاش تەواوکردنی سوننەتی تەراویح، سێ رەکعەت وەتر دەکرێ (دوو رەکعەت بەیەکەوە پاشان یەك رەکعەت بە تەنیا)و پاش (١٥) ی

(1) هەندێ ذیکر هەیە لە نێوان رەکعەتەکان، ئەمە نە واجبەو نە سوننەتە.

ڕەمەزان لە تاکە وەتر (قنوت)[1] دەخوێنرێ.

## ٢- نوێژی هەردوو جەژنە (صلاة العيدين)

نوێـــژی جـــەژنی ڕەمـــەزانو جـــەژنی قوربـــان ســـوننەتێکی (مؤکـــدە)و زۆر خێـــرن، چـــونکە پێغەمبـــەر (ﷺ) لـــە جـــەژنی ڕەمـــەزانی ســـاڵی دووەمی کۆچی یەوە لـە سـەری بـەردەوام بـووە. سوننەتە بە جەماعـەت بکـرێ، چـونکە پێغەمبـەر (ﷺ) بـە جەماعـەت کردویـەتی. ڕاسـتە نوێـژی جەژنەکان بە جەماعەت خێریان زیاترە، بەڵام

---

[1] (اللهم اهدني فيمن هديت، وعافني فيمن عافيت ، وتـولني فيمن توليت ،وبارك لي فيما اعطيت ، وقني شر ما قضيت، فانك تقضي ولا يقضى عليك،وانه لايذل من واليت ولايعز من عاديت، تباركت ربنا وتعاليت …… وەچـەندی دەتـەوێت دوعا بکەوپاشـان سـەلەواتێك لەسـەر گیـانی خۆشەویست بدەو برۆ سوجدە.

## چۆنیەتی نوێژی تەراویح

دوو رەکعەت دوو رەکعەت سەلام دەدەیەوە، لە کاتی نیەت هێنان دەڵێی: (نويت أُصَلي رَكْعَتَينِ صَلاةَ التَّراويحِ – قيام الليل – للهِ تَعالى، الله أكبر). (نیەتم وایە دوو رەکعەت نوێژی تەراویح دەکەم بۆ خوای گەورە الله أكبر).

وەکو نوێژی بەیانی دوو رەکعەت دەکەیتو پاش تەحیات سەلام بدەوەو بەم شێوەیە نوێژەکانی تر تەواو دەکەیت[1].

لە پاش تەواوکردنی سوننەتی تەراویح، سێ رەکعەت وەتر دەکرێ (دوو رەکعەت بەیەکەوە پاشان یەك رەکعەت بە تەنیا)و پاش (١٥) ی

---

[1] هەندێ ذیکر هەیە لە نێوان رەکعەتەکان، ئەمە نە واجبەو نە سوننەتە.

ڕەمەزان لە تاکە وەتر (قنوت)[1] دەخوێنرێ.

## ٢- نوێژی هەردوو جەژنە (صلاة العيدين)

نوێـژی جـەژنی ڕەمـەزانو جـەژنی قوربـان سـوننەتێکی (مؤکـده)و زۆر خێـرن، چـونکە پێغەمبـەر (ﷺ) لـە جـەژنی ڕەمـەزانی سـاڵی دووەمی کۆچی یەوە لـە سـەری بـەردەوام بـووە. سوننەتە بە جەماعـەت بکرێ، چونکە پێغەمبـەر (ﷺ) بـە جەماعـەت کردویـەتی. ڕاسـتە نوێـژی جەژنەکان بە جەماعەت خێریان زیاترە، بەڵام

---

[1] (اللهم اهدني فيمن هديت، وعافني فيمن عافيت ، وتـولني فيمن توليت ،وبارك لي فيما اعطيت ، وقني شر ما قضيت، فانك تقضي ولا يقضى عليك،وانه لايذل من واليت ولايعز من عاديت، تباركت ربنا وتعاليت ...... وەچـەندی دەتـەوێت دوعا بکەوپاشـان سـەلەواتێك لەسـەر گیـانی خۆشەویـست بدەو برۆ سوجدە.

مرۆڤـی بەتـەنهاو ئـافرەتو کۆیلـەو ڕێبـواریش سوننەتە ئەم نوێژە بکەن.

## کاتی نوێژی هەردوو جەژن

کـاتی نوێـژی هـەردوو جەژنـەکان لـەنێوان ڕۆژ هەڵاتنو لادانی ڕۆژ دایە.

سـوننەتە: نوێـژی جەژنـەکان دوابخـرێ تـا ڕۆژبەقەد ڕمێك بەرز دەبێتەوە.

### چۆنیەتی نوێژی جەژن

نوێژی هەردوو جەژنەکە، دوو ڕەکعەتەو ڕوکنو مەرجو سوننەتەکانی وەکو نوێژەکانی ترە، بـەڵام بانگی بۆ نادرێو ئیقامەتیشی بۆ ناکرێ (**عَنْ جابر بـن سُـمرَة: قـال: صَـلَّيتُ مَـعَ رَسُـولُ الله (ﷺ) العِيدَينِ،غَيرمَرَّةٍ وَلا مَرَّتَينِ بِغَيرِ آذانٍ وَلا إقامَةٍ**)[1]

---

1) رواه مسلم (٨٨٧).

واتا (زیاتر لە جارێكو دوو جار نوێژی هەردوو جەژنەکانم بە جەماعەت لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) کرد، بە بێ بانگو ئیقامەت).

لە جیاتی بانگو ئیقامەت یەکێك دوو جار دەڵێ: (الصَّلاةُ جامعَة)و پاشان نیەت دەهێنی (نويتُ أُصَلي ركْعَتَيْنِ سُنة صَلاةَ عيد الفَطر(عيد الأضحى) لله تَعالى، الله أكبر). (نیەتم وایە دوو رەکعەت سوننەتی نوێژی جەژنی ڕەمەزان (قوربان) بۆ خوای گەورە دەکەم، الله أكبر).

ئەوجا لەگەڵ (اللهُ أكْبَر) نوێژەکە دادەبەستێو دوعای إفتتاح دەخوێنێو (٧) جار دەڵێی (اللهُ أكْبَر) جگە لە (اللهُ أكْبَر) ی نوێژ دابەستن، لەنێوان گشت دوو (اللهُ أكْبَر) ێك لەو حەوتانەدا سوننەتە بوەستی بە ئەندازەی ئایەتێکی ناوەنجیو لەو وەستانەدا ژیکری (سُبحَانَ اللهِ

مرۆڤـی بەتـەنهاو ئـافرەتو کۆیلـەو ڕێبـواریش سوننەتە ئەم نوێژە بکەن.

## کاتی نوێژی هەردوو جەژن

کـاتی نوێـژی هـەردوو جەژنـەکان لـەنێوان ڕۆژ هەڵاتنو لادانی ڕۆژ دایە.

سـوننەتە: نوێـژی جەژنـەکان دوابخـرێ تـا ڕۆژبەقەد ڕمێك بەرز دەبێتەوە.

### چۆنیەتی نوێژی جەژن

نوێژی هەردوو جەژنەکە، دوو ڕەکعەتەو ڕوکنو مەرجو سوننەتەکانی وەکو نوێژەکانی ترە، بـەڵام بانگی بۆ نادرێو ئیقامەتیشی بۆ ناکرێ (عَنْ جابر بـن سُـمرَةَ: قـال: صَـلَّيتُ مَـعَ رَسُـولُ الله (ﷺ) العِيدَينِ،غَيرمَرَّةٍ وَلا مَرَّتَينِ بِغَيرِ آذانٍ وَلا إِقامَةٍ)[1]

---

1) رواه مسلم (٨٨٧).

واتا (زیاتر لە جارێكو دوو جار نوێـژی هـەردوو جەژنــەكانم بــە جەماعــەت لەگــەڵ پێغەمبــەردا (ﷺ) كرد، بە بێ بانگو ئیقامەت).

لـە جیـاتی بـانگو ئیقامـەت یـەكێك دوو جـار دەڵێ: (الـصَّلاةُ جامعَـة)و پاشـان نیـەت دەهـێنی (نويتُ أُصَلي رَكْعَتَيْنِ سُنة صَلاةَ عيد الفَطـر(عيـد الأضـحى) للهِ تَعـالى، الله أكـبر). (نیـەتم وایـە دوو رەكعــەت ســوننەتی نوێــژی جــەژنی ڕەمــەزان (قوربان) بۆ خوای گەورە دەكەم، الله أكبر).

ئەوجا لەگەڵ (اللهُ أكبَر) نوێژەكە دادەبەستێو دوعـای إفتتـاح دەخـوێنیو (٧) جـار دەڵێـی (اللهُ أكْبَـر) جگـە لــە (اللهُ أكْبَــر) ی نوێــژ دابەســتن، لەنێوان گشت دوو (اللهُ أكْبَـر) ێك لـەو حەوتانـەدا ســوننەتە بوەســتی بــە ئەنــدازەی ئایــەتێكی ناوەنجیو لەو وەستانەدا ژیكری (سُبحَانَ اللهِ

وَالحَمْدُ للهِ وَلا إِله إلا الله وَاللهُ أكْبَر بڵێ.

ئینجا ده‌ست به‌ خوێندنی سوره‌تی فاتیحه‌و سوره‌تێك [1] له‌دوای فاتیحه‌ بكه‌، له‌ ره‌كعه‌تی دووه‌م (٥) جار بڵێ (اللهُ أكْبَر) جگه‌ له‌ (اللهُ أكْبَر) ی هه‌ڵسانه‌وه‌، ئه‌وجا فاتیحه‌ ده‌خوێنیو سوره‌تێكیش له‌ دوای فاتیحه‌، تا ده‌گه‌یه‌ ته‌حیاتو سه‌لام ده‌ده‌یه‌وه‌.

سوننه‌ته‌: هه‌ردوو ده‌سته‌كانت به‌رز بكه‌یه‌وه‌تا به‌رامبه‌ر شانه‌كانت له‌ گشت(اللهُ أكبر)ه‌كاندا [2].

---

(1) له‌ فه‌رمووده‌یه‌ك هاتووه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) له‌ جه‌ژنه‌ له‌ ره‌كعه‌تی یه‌كه‌م دوای فاتیحه‌ سوره‌تی (ق وَالقُرآنِ المَجید) و له‌ دووه‌م (اقتَرَبَتِ السَّاعةُ وانشَقَّ القَمَر) ی خوێندووه‌.

(2) ئه‌و (اللهُ أكْبَر) انه‌ی، ناو نوێژی جه‌ژن ڕوكن نین، ئه‌گه‌ر نه‌شڵێی نوێژه‌كه‌ به‌ تاڵ نابێ.

ئینجا سوننەتە لە دوای تەواو بوونی نوێژی جەژن دوو خوتبە بخوێندرێتەوە[1].

قوربانی کردن دوای نوێژی جەژنی قوربان دەبێ‌و هەر کەسێك پێش جەژن بیکوژێتەوە، بە قوربانی ناچێت‌و دەبێتە سەدەقە.

## سوننەتەکانی جەژن

١- خۆ شوشتن.

٢- خۆ بۆنخۆش کردن.

٣- خۆ ڕازاندنەوە بە جوانترین جل‌و بەرگ.

٤- ڕێگە گۆڕین لە کاتی هاتن‌و گەڕانەوە.

٥- زوو چوونە مزگەوت.

٦- سوننەتە لە جەژنی ڕەمەزان پێش چوونە مزگەوت شتێك بخوات بەڵام لە جەژنی قوربان

(1) بۆ ئەوانەی لە مزگەوتن.

وَالحَمْدُ للهِ وَلا إِلهَ إلا اللهُ وَاللهُ أَكْبَر) بلّێ.

ئینجا دەست بە خوێندنی سورەتی فاتیحەو سورەتێك [1] لەدوای فاتیحە بکە، لە رەکعەتی دووەم (٥) جار بلّێ (اللهُ أَكْبَر) جگە لە (اللهُ أَكْبَر)ی هەڵسانەوە، ئەوجا فاتیحە دەخوێنیو سورەتێکیش لە دوای فاتیحە، تا دەگەیە تەحیاتو سەلام دەدەیەوە.

سوننەتە: هەردوو دەستەکانت بەرز بکەیەوەتا بەرامبەر شانەکانت لە گشت(اللهُ أكبر)ەکاندا [2].

---

(1) لە فەرموودەیەك هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) لە جەژنە لە رەکعەتی یەکەم دوای فاتیحە سورەتی (ق وَالقُرآنِ المَجيد) و لە دووەم (اقتَرَبَتِ السَّاعةُ وانشَقَّ القَمَر) ی خوێندووە.

(2) ئەو (اللهُ أكبَر) انەی، ناو نوێژی جەژن رکن نین، ئەگەر نەشلّێی نوێژەکە بە تالّ نابیّ.

ئینجا سوننەتە لە دوای تەواو بوونی نوێژی جەژن دوو خوتبە بخوێندرێتەوە[1].

قوربانی کردن دوای نوێژی جەژنی قوربان دەبێ‌و هەر کەسێك پێش جەژن بیکوژێتەوە، بە قوربانی ناچێت‌و دەبێتە سەدەقە.

## سوننەتەکانی جەژن

١- خۆ شوشتن.

٢- خۆ بۆنخۆش کردن.

٣- خۆ ڕازاندنەوە بە جوانترین جل‌و بەرگ.

٤- ڕێگە گۆڕین لە کاتی هاتن‌و گەڕانەوە.

٥- زوو چوونە مزگەوت.

٦- سوننەتە لە جەژنی ڕەمەزان پێش چوونە مزگەوت شتێك بخوات بەڵام لە جەژنی قوربان

(1) بۆ ئەوانەی لە مزگەوتن.

هیچ نەخوات.

٧- تکبیر زۆر لێ بدات[1].

## ٣- نوێژی ڕۆژ گیرانو مانگ گیران

نوێژی ڕۆژگیرانو مانگ گیران (سنة مؤكَدە) یە، بۆ پیاوو ئافرەت، مرۆڤی بە تەنهاو ڕێبوارو کۆیلە.

ئەم نوێژە دوو ڕەکعەتەو بە سێ شێوە دەکرێ، بەڵام من شێوە تەواوو کاملەکەی باس دەکەم:

لە کاتی نیەت هێنان دەڵێی: (نويتُ أُصَلي سنة صلاة الكسوف (الخسوف) ركعَتَينِ للهِ تعالى، الله أكبَر).

(1) واته بلّێت (اللهُ أكْبَر، اللهُ أكْبَر، اللهُ أكْبَـر لا إلـهَ إلا الله واللهُ أكْبَر، اللهُ أكْبَر وَللهِ الحَمْد).

(نیەتم وایە دوو ڕەکعەت نوێژی ڕۆژگیرانِ (مانگ گیران) دەکەم بۆ خوای گەورە، الله أکبر).

دوعای (توجە) دەخوێنیٚو (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم) و سورەتی فاتیحە دەخوێنیو، سورەتێکی کورتیش دەخوێنیو دەچیە رکوع، ئینجا لە رکوع کە هەستایەوە مەچوو بۆ سوجدە، بەڵکو دووبارە دەستت بگرەوەو سورەتی فاتیحە بخوێنەو، سورەتێکی کورتیش بدە دوای، ئەوجا برۆ رکوع — کە هەستایەوە، ئەوجار برۆ سوجدە، هەردوو سوجدەکان ببەو هەستەوە بۆ ڕەکعەتی دووەم، ئەویش وەکو ڕەکعەتی یەکەم ئەنجام بدە.

پاش تەواو بوونی ئەم نوێژە، سوننەتە ئیمام دوو خوتبە بخوێنێتەوە، وەکو خوتبەی جومعەو هانی خەڵك بدات بۆ تەوبەو گەڕانەوە.

هیچ نەخوات.

٧- تکبیر زۆر لێ بدات[1].

## ٣- نوێژی ڕۆژ گیران و مانگ گیران

نوێژی ڕۆژگیران و مانگ گیران (سنة مؤکدە) یە، بۆ پیاوو ئافرەت، مرۆڤی بە تەنهاو ڕێبوارو کۆیلە.

ئەم نوێژە دوو ڕەکعەتەو بە سێ شێوە دەکرێ، بەڵام من شێوە تەواوو کاملەکەی باس دەکەم:

لە کاتی نیەت هێنان دەڵێی: (نويتُ أُصَلي سنة صلاة الكسوف (الخسوف) ركعَتَينِ للهِ تعالى، الله أكبَر).

(1) واتە بڵێیت (اللهُ أكبَر، اللهُ أكبَر، اللهُ أكبَر لا إلهَ إلا الله واللهُ أكبَر، اللهُ أكبَر وَللهِ الحَمْد).

(نیەتم وایە دوو رەکعەت نوێژی ڕۆژگیران (مانگ گیران) دەکەم بۆ خوای گەورە، الله أكبر).

دوعای (توجە) دەخوێنیو (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم) و سورەتی فاتیحە دەخوێنیو، سورەتێکی کورتیش دەخوێنیو دەچیە رکوع، ئینجا لە رکوع کە هەستایەوە مەچوو بۆ سوجدە، بەڵکو دووبارە دەستت بگرەوەو سورەتی فاتیحە بخوێنەو، سورەتێکی کورتیش بدە دوای، ئەوجا بڕۆ رکوع — کە هەستایەوە، ئەوجار بڕۆ سوجدە، هەردوو سوجدەکان ببەو هەستەوە بۆ رەکعەتی دووەم، ئەویش وەکو رەکعەتی یەکەم ئەنجام بدە.

پاش تەواو بوونی ئەم نوێژە، سوننەتە ئیمام دوو خوتبە بخوێنێتەوە، وەکو خوتبەی جومعەو هانی خەڵك بدات بۆ تەوبەو گەڕانەوە.

## ٤- نوێژی باران (صلاة الإستسقاء).

ئه‌م نوێژه‌ش سوننه‌تێكی (مؤكَدة) بۆ گشت كه‌سێك، به‌ تاكو كۆمه‌ڵ ده‌كرێت.

ئه‌م نوێژه سوننه‌ته بكرێ له كاتی پێویست: باران نه‌بارێ، ڕووبار، سه‌رچاوه ووشك بێ، ئاو كه‌م بێته‌وه‌و تێری خه‌ڵك نه‌كاو ده‌شتوانن دووباره‌ی بكه‌نه‌وه.

سوننه‌ت وایه پێش نوێژ كردن، خه‌ڵكه‌كه سێ ڕۆژ به‌ڕۆژوو بن و ئه‌وجار ده‌چنه بیابانێكی ده‌ره‌وه‌ی شار له ڕۆژی چواره‌مو خه‌ڵكه‌كه‌ش هه‌ر به ڕۆژووه‌و به به‌رگێكی كۆنی كاركردنداو به زه‌لیلی‌و ملكه‌چی‌و پاڕانه‌وه‌و نوزانه‌وه‌و منداڵه‌كانیش له گه‌ڵ خۆیان ده‌به‌نه ده‌ره‌وه، هه‌روه‌ها پیره‌ژن‌و پیره مێردیش له‌گه‌ڵ خۆیان ده‌به‌ن، چونكه دوعای ئه‌وان زووتر قبوڵ ده‌بێ.

# چۆنیه‌تی نوێژی باران

ئه‌م نوێژه وه‌كو نوێژی جه‌ژنه، دوو ره‌كعه‌تـه‌و له جیاتی بانگو ئیقامـه‌ت یـه‌كێك ده‌ڵـێ (الـصَّلاة جامِعَـــة)، ئینجـا له‌گــه‌ڵ (اللهُ أكـبر) ی نوێـــژ دابه‌ستندا، نیـه‌ت ده‌هـێنی (نويـتُ أُصَـلِّي سـنة صـلاة الإستـسقاء ركعَـتَينِ للهِ تعـالى، اللهُ أكبَـر) (نیه‌تم وایه دوو ره‌كعه‌ت نوێژی بـاران ده‌كـه‌م بۆ خوای گه‌وره– اللهُ أكبر).

ئینجـا دوعـای الإفتتـاحو ئـه‌وجا لـه ره‌كعـه‌تی یه‌كـه‌م (٧) جـارو لـه ره‌كعـه‌تی دووه‌م (٥) جـار ده‌ڵێـی (اللهُ أكـبر) پـێش فاتیحـه وه‌كـو نوێـژی جه‌ژنه‌كان، ئه‌وجا فاتیحه ده‌خوێنیو سوننه‌ته له دوای فاتیحـه لـه ره‌كعـه‌تی یه‌كـه‌م سـوره‌تی (ق وَالقُرآنِ المَجِيد) یان سوره‌تی (سَبِّحِ اسمَ رَبِّكَ) بخوێنیو له ره‌كعه‌تی دووه‌م له پاش فاتیحه

سـورەتی (اقتَرَبَـتِ الـسَّاعة) یـان (هَـلْ أتَـاكَ) بخـوێنیو لـە هـەردوو رەکعەتەکانیـشدا فاتیحـەو سورەت بە دەنگی ئاشکرا دەخوێندرێت.

لــــە دوای نوێـــژ کـــردن، دوو خوتبـــە دەخوێندرێتەوە وەکو خوتبـەکانی جـەژن، بـەڵام لە سەرەتای خوتبە لە جیاتی (الحَمدُ لله) وتاربیـژ دەڵێ (أستَغْفِرُ الله)[1].

وا باشـە سـێ یـەکی خوتبـەی دووەم بـۆ دوعـا تەرخان بکرێت بە نهێنیو ئاشکراو دەستیان بەرز بکەنـەوەو پـشتە دەسـتەکانیان دەخەنـە لای ئاسمـان (عَـنْ أنَـس بـن مَالـك، أنَّ النَّبِـيَّ (ﷺ)

---

(1) لە خوتبەی جەژنەکان وتاربێژ لە خوتبەی یەکەم (٧) جار دەڵێ (اللهُ أكبر) و لە خوتبەی دووەم (٥) جـار، بـەڵام لـە خوتبـەی نوێژە بارانە لە خوتبەی یەکـەم (٩) جـار دەڵـێ (أستَغْفِرِ الله الّذي لا إلهَ إلا هُوَ الحَيُّ القَيُّـوم وَأتـوبُ إلَيـه) وە لـە خوتبـەی دووەم (٧) جار دەڵێ.

استَسقَى، فَأشَارَ بِظَهرِ كَفَّيهِ إلى السَّماءِ)[1].

(پێغەمبەر (ﷺ) دوعای بارانی کردو، بە پشتە دەستەکانی ئاماژەی بۆ ئاسمان کرد).

هەروەها وتار خوێنەکە پەشتەماڵەکەی خۆی وەردەگێڕێ لەو کاتەی ڕوو لە قیبلە دەکا.

## ٥- نوێژی ترس (صلاة الخوف)

نوێژی ترس هەروەکو سوننەتەکانی ترە لە ڕوکن و مەرج و لە سوننەتەکان، بەڵام هەندێ شتی تایبەتی هەیە.

ئەم نوێژە (١٦) جۆری هەیە، ئیمامی الشّافعي (رضي الله عنه) سێ جۆری هەڵبژاردووە:

---

(1) رواه مسلم (٨٩٦).

* ئەگەر دوژمن لە لای قیبلە بێت:

ئیمام مەئمومەکان دەکاتە دوو ڕیزو، پێکەوە نوێژیان پێ دادەبەستێو نوێژ بە هەردوو ڕیزەکان دەکا، تا هەموویان پێکەوە لە ڕوکووعی ڕەکعەتی یەکەم هەڵدەستنەوە، ئینجا هەرکاتێك ئیمامەکە لە ڕەکعەتی یەکەمدا سوجدەی برد، ڕیزی یەکەم لەگەڵ ئیمامەکە هەردوو سوجدەکان دەبەنو ڕیزی دووەمیش لە هەڵسانەوەی ڕوکوعدا دەمێننەوەو چاودێری دوژمن دەکەن.

ئینجا هەرکاتێك ئیمامو ڕیزی یەکەم لە سوجدە هەڵسانەوە، ئەو کاتە ڕیزی دووەم سوجدە دەباتو لە ڕاوەستانی ڕەکعەتی دووەم دەگەنەوە ئیمام، تاکو گشتیان پێکەوە فاتیحە بخوێننو پێکەوە بڕۆنە ڕوکووعو پێکەوە لە

روکوع هەڵبستنەوە، ئینجا ئیمام دەڕواتە سوجدەی رەکعەتی دووەم، ئەوجارە ڕیزی دووەم لەگەڵی دەچنە سوجدەو ڕیزی یەکەم چاودێری دوژمن دەکەن، ئینجا کە ئیمام بۆ تەحیات دانیشت، ئەوکاتە ئەو ڕیزەی چاودێری کردبوو سوجدە دەبەن و پێکەوە ئیمام تەحیات بە هەردوو ڕیزەکان دەخوێنێ و پێکەوە سەلام بە هەردوو ڕیزەکە دەداتەوە.

ئەو شێوەیە، شێوەی نوێژی پێغەمبەر (ﷺ) بوو لە گوندی (عُسفان).

## ٦- نوێژی مردوو [1].

نوێژی مردوو حەوت ڕوکنی هەیە:

١- نیەت هێنان.

٢- چوار جار وتنی (اللهُ أكبر).

٣- سەلام دانەوە لە دوای تەواو بوونی (اللهُ أكبر) ی چوارەم.

٤- خوێندنی سورەتی فاتیحە.

٥- سەلەوات لێدان لە سەر محمد (ﷺ).

٦- دوعا کردن بۆ مردووەکە لە پاش (اللهُ أكبر) ی سێ یەم.

٧- ڕاوەستان بە پێوە تا نوێژەکە تەواو دەبێ.

---

(1) هەر چەندە نوێژی مردوو فەرزی کفایەیە، بەلاَم حەزم کرد نوێژی مردووش زیاد بکەم بۆ ئەوەی خەڵك فێری ببێت.

## چۆنیەتی نوێژی مردوو

١- ڕوو لە مردووەکە دەکەیت (کە بەرەو قیبلە دانراوە) و دەڵێی: (نَويتُ أُصَلي أربع تكبيرات على هذا المَيت فَرض كِفاية لله تَعالى - الله أكبَرْ).
(نیەتم وایە نوێژ لە سەر ئەو مردووە دەکەم (یان چوار (الله أكبَرْ) لە سەر ئەو مردووە بدەم) کە فەرزی کیفایەیە بۆ خوای گەورە - الله أكبَرْ).

٢- دەستەکانت دەگری وەکو نوێژ، سورەتی فاتیحە دەخوێنی.

٣- کە فاتیحە تەواو بوو، دەڵێی (الله أكبَرْ) و دەستەکانت تا لای گوێ یەکان بەرز دەکەی، دووبارە دەستەکانت دادەنێیتەوەو سەلەوات لە سەر پێغەمبەر (ﷺ) دەدەی.

٤- ئینجا دەڵێی (الله أكبَرْ) و دەستەکانت بەرز دەکەیەوەو دوعا بۆ مردووەکە دەکەی.

٥- دەڵێی (الله أكبَرْ) و دەست بەرز دەکەیەوە ئەوجا هەر لە پێوە سەلام دەدەیەوە.

## سه‌رچاوه‌كان

١- قورئانی پیرۆز.
٢- ته‌فسیری ئاسان بۆ تێگه‌یشتنی قورئان - برهان محمدامین - چاپی پێنجه‌م - قم .
٣- تفسير الكشاف عن حقائق التنزيل وعيون الأقاويل في وجوه التأليف، تأليف: أبِي القاسم جارالله محمود بن عمر الزمخشري الخوارزمي (٤٦٧ - ٥٣٨ هـ)، اعتنى به وخرج أحاديثه وعلقَ عليه: خليل مأمون شيحا، الطبعة الأولى (١٤٢٣ هـ - ٢٠٠٢ م)، دار المعرفة للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت - لبنان.
٤- تفسير القرآن العظيم للإمام الجليل الحافظ عمادالدين أبي الفداء إسماعيل بن كثير القرشي الدمشقي متوفى (٧٧٤ هـ) قدم له عبدالقادر الأرناؤوط الطبعة الثانية (١٤١٨ هـ - ١٩٩٨ م) مكتبة دار الفيحاء دمشق - مكتبة دار السلام - الرياض.
٥- صحيح مسلم بشرح الإمام النووي - رقمه وخرج أحاديثه: محمد فؤاد عبدالباقي، حققه: الشيخ عرفات حسونة، الطبعة الأُولى (١٤٢٠ هـ - ١٩٩٩م) دار احياء

التراث العربي للطباعة والنشر والتوزيع – بيروت – لبنان.

٦- حاشية إعانة الطالبين للسيد أبي بكر المشهور بالسيد البكري بن السيد محمد شطا الدمياطي المصري على حل الفاظ فتح العين شرح قرة العين بمهمات الدين ، لذين الدين بن عبدالعزيز المليباري الفناني، مطبعة مصطفى الباني الحلبِي وأولاده بمصر – الطبعة الثانية(١٩٣٨)م .

٧- التاج الجامع للاصول في أحاديث الرسول (ﷺ) تأليف: الشيخ منصور علي ناصيف، الطبعة الخامسة (١٤١٣ هـ – ١٩٩٣ م) دار احياء التراث العربي، بيروت _ لبنان.

٨- مغني المحتاج الى معرفة الفاظ المنهاج – تأليف شمس الدين محمد بن محمد الخطيب الشربيني – قدم له ورقم كتبه وابوابه: عماد زكي البارودي – حققه وخرج أحاديثه: طه عبدالرؤوف سعد راجعه: محمد عزت، المكتبة التوفيقية.

٩- الفقه الإسلامي الميسر وأدلته الشرعية على طريقة

السؤال والجواب لفضيلة الشيخ محمد متولي الشعراوي، المكتبة العصرية – صيدا – بيروت (١٤٢٦ هـ – ٢٠٠٦ م).
١٠- شه‌ریعه‌تی ئیسلام به پێی په‌یڕه‌وی ئیمامی شافعی (رضي الله عنه) دانراوی مه‌لا عبدالكريمی مدرس – ده‌زگای چاپو بڵاوكردنه‌وه‌ی ڕۆژهه‌ڵات – هه‌ولێر.
١١- كتاب الفقه على المذاهب الأربعة – تأليف: عبدالرحمن الجُزيري. الطبعة الأولى (١٤١٧ هـ – ١٩٩٦ م) دار الفكر للطباعة والنشر والتوزيع بيروت – لبنان.
١٢- الفقه المنهجي على مذهب الإمام الشّافعي (رضي الله عنه)، الدكتور مصطفى الخن – الدكتور مصطفى البُغا، علي الشربجي – دار احسان للنشر والتوزيع طهران – إيران.
١٣- صحيح فقه السنة وأدلته وتوضيح مذاهب الأئمة- اعده أبو مالك كمال بن السيد سالم – المكتبة التوفيقية – امام الباب الأخضر – سيدنا الحسين.
١٤- الأذكار المنتخب من كلام سيد الأبرار – للإمام أبي زكريا يحيى بن شرف النووي، تحقيق: طه عبدالرؤوف

سعد الطبعة الأولى (١٤٢٢ هـ - ٢٠٠١ م) مكتبة الصفا - القاهرة.

١٥- روائع من سيرة الرسول (ﷺ)، فضيلة الشيخ العلاّمة محمد بن صالح العثيمين رحمه الله، جمع وتحقيق: صلاح الدين محمود السعيد دار القمة الأسكندرية - دار الإيمان الأسكندرية.

١٦- المختارات الجلية من المسائل الفقهية - تأليف العلاّمة الشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي رحمه الله- الطبعة الأولى (١٤٢٤ هـ - ٢٠٠٢ م) دار الشريعة للطباعة والنشر والتوزيع - القاهرة- جمهورية مصر العربية.

١٧- القاموس المحيط - تصنيف: إمام أهل اللغة مجدالدين محمد بن يعقوب الفيروز آبادي المتوفى سنة (٨١٧) الطبعة الأولى (١٤٢٤ هـ - ٢٠٠٣ م) دار الفكر للطباعة والنشر والتوزيع.

١٨- مختار الصحاح - تأليف: محمد بن أبي بكر بن عبدالقادر الرازي الناشر: دار الرسالة - كويت (١٤٠٣ هـ - ١٩٨٣ م).

# پێرست



| لاپه‌ڕه | بابه‌ت |
| --- | --- |
| ٣ | پێشه‌كی |
| ٥ | نوێژی سوننه‌ت |
| ٨ | گرنگی نوێژی سوننه‌ت |
| ١١ | نوێژی سوننه‌ت دوو به‌شه |
| ١٢ | یه‌كه‌م: ئه‌وسوننه‌تانه‌ی( سوننه‌ت نییه ) به‌جه‌ماعه‌ت بكرێن |
| ١٣ | أ ـ ئه‌وانه‌ی ( سنه المؤكده ) |
| ١٧ | ب ـ ئه‌و سوننه‌تانه‌ی ( مؤكد ) نین |
| ٢٣ | أ ـ ئه‌و سوننه‌تانه‌ی كاتی دیاریكراوییان هه‌یه |
| ٢٣ | شه‌ونوێژ |
| ٢٩ | ژماره‌ی ره‌كعه‌ته‌كانی شه‌ونوێژ |
| ٣٠ | هه‌ندێ له ئادابه‌كانی شه‌ونوێژ |
| ٣٥ | چۆنیه‌تی ئه نجامدانی شه‌ونوێژ |
| ٣٩ | نوێژی وه‌تر |
| ٤٢ | كاتی نوێژی ( وتر ) |
| ٤٦ | صلاة الضُحى- چێشته نوێژ |
| ٤٨ | كاتی چێشته نوێژ |

| | |
|---|---|
| چۆن چێشته نوێژ ده‌كرێت؟! | ٤٩ |
| صلاة الاستخارة | ٥٠ |
| چۆنیه‌تی صلاة الاستخاره | ٥٠ |
| صلاة التوبة - نوێژی ته‌وبه‌كردن | ٥٣ |
| صلاة التسبيح | ٥٥ |
| چۆنیه‌تی صلاة التسبيح | ٥٦ |
| صلاة الحاجة ( نوێژی داواكاری ) | ٥٧ |
| سه‌لامی مزگه‌وت ( تحية المسجد ) | ٥٩ |
| نوێژی رێبوار ( قصر و جمع ) | ٦١ |
| مه‌رجه‌كانی كورت كردنه‌وه‌ی نوێژ | ٦٣ |
| چۆنیه‌تی ئه‌نجامدانی نوێژی ( قصر ) | ٦٩ |
| أ- پێشخستنی نوێژی دووه‌م ( جمع التقديم ) | ٧٢ |
| ب- دواخستنی نوێژی یه‌كه‌م ( جمع التاخير ) | ٧٣ |
| چه‌ند ره‌وشتێكی سه‌فه‌ر | ٧٥ |
| سوننه‌تی ده‌ستنوێژ ( سنة الوضوء ) | ٨٠ |
| صلاة الأوابين | ٨١ |
| نوێژی رۆژ هه‌ڵاتن ( صلاة الاشراق ) | ٨٢ |
| ئه‌و سوننه‌تانه‌ی كاتی دیاریكراویان نیه | ٨٢ |

| | |
|---|---|
| دووه‌م ـ ئه‌و سوننه‌تانه‌ی خێر تره به جه‌ماعه‌ت بكرێن | ٨٤ |
| ١- نوێژی ته‌راویح | ٨٤ |
| چۆنیه‌تی نوێژی ته‌راویح | ٨٩ |
| ٢- نوێژی هه‌ردوو جه‌ژنه ( صلاه العیدین ) | ٩٠ |
| كاتی نوێژی هه‌ردوو جه‌ژن | ٩١ |
| سوننه‌ته‌كانی جه‌ژن | ٩٤ |
| ٣- نوێژی ڕۆژ گیران و مانگ گیران | ٩٥ |
| ٤- نوێژی باران ( صلاه الإستسقاو ) | ٩٧ |
| ٥- نوێژی ترس ( صلاه الخوف ) | ١٠٠ |
| ٦ - نوێژی مردوو | ١٠٣ |
| چۆنیه‌تی نوێژی مردوو | ١٠٤ |
| سه‌رچاوه‌كان | ١٠٥ |